

ژمـاره

٦

(تشرینی دووەم ) ی ٢٠٠٥

# گۆڤـاری کۆمپیوتەر

گۆڤارێکی مانگانەی تایبەتە بەبواری کۆمپیوتەرو ئینتەرنێت ـ وەزارەتی رۆشنبیری دەری دەکات

www.compmagz.com




- چۆنێتی دروست کردنی دەفتەر ی تەلەفۆنات لەسەر کۆمپیوتەر .
- ناردن و وەرگرتنی فاکس لە ویندۆز XP.
- دونیای مۆسیقا لەگەڵ تەکنۆلۆژیای سەردەم.



- وێب سایدێك بۆ فرۆشتنی مندالآن .
- چۆنیەتی ئەنجامدانی پەیوەندی تەلەفۆنی بە ئەنتەرنێت .



پاشکۆی گۆڤار : سی دی تایبەت بە گۆڤارەکە

هەولێر ـ ٢٠٠٥

# ئایا مرۆڤ زیرەك ترە یان كۆمپیوتەر؟

## سەر نووسەر

لەم جیهانەی كە پەروەردگاری مەزن درووستی كردوە زۆر جار باسی سەیرمان بەرگوێ دەكەوێت لەو باسە سەیرانەش زۆر جار گوێم لێ بووە كە خەڵكی دەڵێن كۆمپیوتەر لە مرۆڤ زیرەكترە یان دەڵێن قەت فێری بەكارهێنانی ئەو ئامێرە نابین من چەند رۆژێك لەمە و پێش گوێم لە هەندی برادەر بوو كە باسی كۆمپیوتەریان دەكرد و لەبەر خۆیانەوە دەیانگووت واللە كۆمپیوتەر لە مرۆڤ زیرەك ترە و قەت فێری نابین منیش بەلامەوە زۆر سەیر بوو كە خەڵكی ئەوەندە سادە و ساكارانە قسە دەردەپەڕێنن و بێ ئەوەی بیری لێ بكەنەوە منیش هەر لەگەڵ ئەواندا ڕاوەستا بووم كەچی نەمتوانی خۆم ڕابگرم و بێ دەنگ بم چوونكە بێ دەنگ بوونم دەبووە مایەی ئەوەی كە ئەو برادەرانە ئەو بیرەیان هەر بەو شێوەیە بمێنێتەوە و هەول نەدەن بۆ فێر بوونی ئەو ئامێرەی كە مرۆڤ بۆ خزمەت كردنی خۆی بەكاری دێنێ بەڵكو لەگەڵ ئەواندا كەوتمە گفت و گۆ كردن لەو بارەیەوە و پێم گوتن چۆن دەزانن كە كۆمپیوتەر لە مرۆڤ زیرەك ترە كەچی ئەوان گۆتیان ئەی چۆن ئەوەی كە كۆمپیوتەر دەیزانێ و دەیكات مرۆڤ ناتوانێ بیكات منیش بەڕوویاندا پێكەنیم و گوتم باشە برایان ئێوە دەزانن كۆمپیوتەر بەكار بێنن ؟ ئەوانیش گوتیان نا واللە نازانین بەس خۆ تۆ دەزانی وایە یان نا ئەوان چاوەڕێی وڵامی ئەوەیان دەكرد كە پێیان بڵێم وایە كەچی گۆتم نەخێر وا نیە لایان سەیر بوو گوتیان چۆن وا نیە گوتم برادەران ئێوە دەزانن چی كۆمپیوتەری درووست كردوە گوتیان بەڵێ مرۆڤ درووستی كردوە گوتم باشە دەزانن لە چەند پارچە پێك هاتووە گوتیان نەخێر گوتم دەزانن كاتێك كە درووست كراوە قەبارەی چەند بووە گوتیان نەخێر گوتم دەزانن ئەو بەرنامانەی كە لەسەر كۆمپیوتەر دادەنرێن كێ دایان دەنێت گوتیان نەخێر گوتم دەزانن سیستەم و بەرنامەكانی چۆن كار دەكات گوتیان نەخێر منیش وەڵامم دانەوە و گوتم برادەران ڕەنگە كۆمپیوتەر لە ئامێرە كارەبایی و ئەلكترونیەكانی تر هەندێك زیرەك تر بێت چوونكە مرۆڤ هەندێك یەدەكی هەستیاری بۆ درووست كردوە كە بتوانێ شتی لە ناودا بپارێزێت واتا( خەزن ) بكەیت وەكوو ( هارد ) یان یەدەكی بیر كردنەوە ( ڕام ) یان یەدەكی خێرایی ( پرۆسێسەر ) ئەم یەدەكانە دەبنە هۆی زیرەكی ئەو ئامێرە كە ئەوانیش لە دەست كردی مرۆڤن بەڵام هەرگیز ئەو ئامێرە لە مرۆڤ زیرەك تر نیە چوونكە مرۆڤ خۆی ئەو ئامێرەی درووست كردوە و لە سەرەتای درووست بوونی ئەو ئامێرەش ئامێرێكی زۆر گەورە بووە و توانایەكی كەمی هەبوو بۆ كار كردن و تەنها كاری ژمێریاری ئەنجام دەدا بەڵام زیرەكی مرۆڤ وای كرد كە ئەو ئامێرە پێش بكەوێت و قەبارەی بچووك تر بێت و توانای كار كردن و خەزن كردن و لێكدانەوەی زیاد كردوە واتا لەگەڵ هاتنی ڕۆژگار زیرەكی مرۆڤ توانی ئەو ئامێرە گەورەیەی كە پێش تر تەنها كاری ژمێریاری پێ دەكرد قەبارەی بچووك بكاتەوە و زۆر كاری تری تێدا زیاد كرد و بە توانای كرد تا گەیشتە ڕۆژگاری ئەمڕۆمان كە ئێستا بە بێ ئەو ئامێرە هەست ئەكەین نوقسانێكی گەورەمان هەیە و هەر مرۆڤیش كاری لەسەر دەكرد و بەرنامەی بۆ درووست دەكرد و كاری لەسەر ئەو بەرنامانە دەكرد و دواتر پێم گوتن برادەران ئەو كۆمپیوتەرەی كە ئێوە دەڵێن لە مرۆڤ زیرەك ترە ئەگەر مرۆڤ پێی نەكات و كاری لەسەر نەكات ئەوا هەرگیز خۆی لە خۆیەوە پێ نابێت و كار ناكات واتا كۆمپیوتەر بە بێ مرۆڤ وەكوو ئامێرێكی كارەبایی بێ هەست و نەستە و تا مرۆڤ بە زیرەكی خۆی بەكاری نەهێنیت و بەرنامەی بۆ دانەنێت ئەوا هەرگیز هیچ كارێكت لە خۆیەوە بۆ ئەنجام نادات ئنجا من لێرەوە بە هەموو خوێنەرانی ئەم گۆڤارە و بە هەموو خەڵكی لە جیهاندا دەڵێم مرۆڤ زیرەك ترین درووست كراوی یەزادانە و هیچ شتێك لە مرۆڤ زیرەك تر نیە و هەر مرۆڤ بوو مانگی دەست كردی دروست كرد و ناردی بۆ ئاسمان و هەر مرۆڤ بوو فرۆكەی درووست كرد و هەر مرۆڤ بوو ئامێری تەلەفۆنی درووست كرد و هەر مرۆڤیشە سەدان و هەزاران ئامێری سەیر و سەمەرەی درووست كردوە و بە بەردەوامی درووست دەكات ئێمەش مرۆڤین ئەگەر مێشكی خۆمان بۆ زانست بەگەر بخەین ئەوا دەتوانین لە كۆمپیوتەریش زیاتربە دەست بهێنین و ئامێری پێشكەوتوو تریش دابهێنین و فێری بەكار هێنان و درووست كردنی بەرنامەش ببین بە ئاسانی ئەگەر خۆمان حەز بكەین هیچ كەسێك لە خۆیەوە فێری بەكار هێنانی ئەو ئامێرە نابێت بەڵكوو دەبێت هەوڵ بدەیت بۆ فێربوونی و من بەش بە حاڵی خۆم ئێستا زۆر گەشبینم بۆ بەرەو پێش چوونی ئەو زانستە لە كوردستانی خۆشەویستمان چوونكە ئێستا سەدان سەرچاوەی باش هەیە بۆ فێربوونی ئەو زانستە هەر لە كتێب و گۆڤار و لا پەڕەی تایبەت بە كۆمپیوتەر لە ڕۆژنامەكان و چەندین سەرچاوەی تری وەكوو ئەنتەرنێت و بەرنامەی تایبەت بە كۆمپیوتەر لە كەناڵەكانی تەلەفزیۆن و............. هتد.

ژمارە ( 6 )
تشرینی دووەم
2005

# گۆڤاری کۆمپیوتەر

گۆڤارێکی مانگانەی تایبەتە بە بواری کۆمپیوتەر و ئەنتەرنێت . وەزارەتی رۆشنبیری دەری دەکات


## تێبینی : هەموو پەیوەندیەکان لە رێگای سەرنووسەرەوە دەبێت


**خاوەنی ئیمتیاز**
وەزیری رۆشنبیری
سامی شۆڕش

**سەرنووسەر**
ئاراز مەولود رەشید

**بەڕێوبەری نووسین**
فاخر مەحمود میرزا

**بەڕێوبەری هونەری**
یاسین عاصم

**دەستەی نووسەران**
رێناز ئەردەلان بەکر
کاوە سلیمان
شاخەوان عمر حەسەن

**دیزاینی بەرگ**
عەزیز ئەسعەد

سەرپەرشتی چاپ
نهرو محمود
چاپخانەی پەروەردە



ناونیشان :
هەرێمی کوردستانی عیراق / هەولێر . دیوانی وەزارەتی رۆشنبیری . شەقامی شەست مەتری نزیک هۆڵی زەرد
بۆ هەر پێشنیارو تێبینی و سەرنجێك یان ناردنی بابەتێك . پەیوەندی بکەن بە سەرنووسەرەوە
بەم ناونیشانە : دیوانی وەزارەتی رۆشنبیری . بەرێوبەرایەتی کۆمپیوتەر . یان بە ژمارە تەلەفۆنی
2232721 مۆبایل 07504618045 یان پۆستی ئەلکترۆنی



Email : computer_magazine_2005@yahoo.com
Email : aras_co_center@yahoo.com






















SAMSUNG
MMS Sending......

# بەرنامەیەک بۆ دروست کردنی دەفتەری تەلەفۆنات

ئا: هێرش اسماعیل

کێشەی لەبیرچون و ونبونی دەفتەری تەلەفۆنات لەناو خەڵکدا زۆربـاوە یان نەبونی دەفتەری باش و بچوک و نوسینی زۆرترین ژمارە تیدا زۆر کەمە یان خەلکانێک بە دەست دران و لەناو چونی دەفتەرەکانیان دەنالێنن، یان هەندێک کەس حەز ناکەن کەس سەیری ژمارەی تەلەفۆنەکان و ناونیشانی دۆست و کەس و کاریان بکەن، یان بۆ ئەوەی لە هەرشوێنێک بتەوەی کە هێلی ئەنتەرنێتی پێوە بەستراببێت زۆر بەئاسانی بگەیتە ژمارە پێویستەکان و بەبێ ئەوەی بارگرانی هەلگرتنی دەفتەرت هەبێت یان لە ونبون و لەناوچونی بترسێیت، ئەوا لەرێگای بەرنامەی EASY PHONEBOOK دەتوانین دەفتەرێکی ئەلیکترۆنی بۆ ناونیشان و ژمارەی تەلەفۆن و مۆبایلەکان بنوسین .

ئەم بەرنامەیە تەنها خزمەت گوزاری دەفتەری تەلەفۆنات پێشکەش ناکات بەلکو دەتوانرێت ناونیشانی پۆستی




وێنەی (١)

ئەلیکترۆنی و ماڵپەرەکانی ئەو کەسەش لەگەڵی خەزن بکەیت جگە لەمەش دەتوانرێت لەگەڵ ئەنتەرنێت بیبەستیت بەمەش لەهەر شوێنێک بێت دەتوانیت ژمارەکان و ناونیشانە پێویستەکان ببینیت.

وێنەی ژمارە (١ ) روکاری بەرنامەکە دەردەخات دوای نوسینی ناونیشانەکان کە زۆر بەئاسانی دەتوانرێت ژمارەو ناونیشانەکان بنوسین ئینجا دەتوانین هەر کردارێکی تر مەبەستمان بێت بیکەین وەکو باسمان کرد پەیوەست کردنی بە ئەنتەرنێت یان ناردنی بە پۆستی ئەلیکترۆنی یان باک ئەپ کردنی، بۆ زیاد کردنی یان دەست کاریکردن یان گۆرینی




وێنەی (٢)

ژمارەیەک ئەوا لەسەرەتادا کلیک لەسەر فایل دەکەین پاشان (NEW RECORD) هەڵدەبژێرین بڕوانە وێنەی ژمارە (٢) . بۆ زیاتر دڵنیا بوون بڕوانە وێنەی ژمارە (٣) چۆنیەتی نوسینی ژمارەو ناونیشانەکان لەم بەرنامەیە دەردەخات . ئینجا لەبەشی زانیاریە گشتیەکان دا ئەو زانیاریانە دەنوسین هەروەک لە وێنەی (٣) دیارە پاشان زانیاریە تایبەتیەکان دەنوسین بەم شێوەی لە وێنەی (٤) دیارە .

لەدوایدا پەیوەندی کرن بەم برادەرە یان هەرکەسێکە کە تەواوی زانیاریەکانت وەرگرتوە بە یەک کلیک بە جێ دەگەیێنێت بۆنمونە ئەگەر بتەوێ نامەیەکی بۆ بنێری ئەوا یەک کلیک لەسەر ئیمەیڵەکە دەکەیت یان بتەوێ سەردانی سایتەکە بکەیت بەهەمان شێوە یان ئەگەر تەلەفۆن بکەیت چونکە لەهەمان کاتدا تەلەفۆنەکانیشت بۆ جیادەکاتەوە . کە بۆ ماڵەوەی بکەیت یان بۆ شوێنی کاری یان بۆ شەخسی خۆی.



وێنەی (٣)

وێنەی (٤)

# زنجیرەی (٥) بۆ فێربوونی بەرنامەی ئەگسێس

ئا: ڕێبوار نوری سعید




وێنەی (١)

## کوێری:

بریتیە لەو تەنانەی کە بە هۆیەوە ئەتوانیت خشتەکان وەک سەرچاوە بۆ وەرگرتنی داتا بەکاربێنیت بۆ:

١- پیشاندانی داتا
٢- گۆڕینی داتا
٣- شیکارکردنی داتا
٤-فلتەرکردنی داتا

هەروەها ئەتوانرێت وەک سەرچاوەی داتا بەکاربهێنرێت لەکاتی دروست کردنی فۆرم و ڕاپۆرت دا.

چەند جۆرێک لە کوێریمان هەیە:

١-SELECT QUERIES
٢-PARAMETER QUERIES
٣-CROSSTAB QUERIES
٤- ACTION QUERIES
٥-SQL QUERIES

جۆری یەکەمیان SELECT QUERIES لە هەموویان زیاتر بەکاردێت، بۆ ئەو کەسانەی کە لە نوێوە فێری بەرنامەی ئەکسس دەبن تەنها ئەم ڕێگایە باس دەکەین.

SELECT QUERIES

ئەم جۆرەیان لە هەموویان زیاتر بەکاردێت وە داتا لە خشتەیەک یان زیاتر وەردەگرێت و لە شێوەی لاپەڕەی خشتە داتا پیشان دەدات کە ئەتوانیت گۆرانکاری و نوێکاری لەسەر داتاکە بکەیت، هەروەها ئەتوانیت ئەم جۆر کوێریە بۆ کۆمەڵ کردن و گروپکردنی تۆمارەکان و کۆکردنەوەی سەرجەم هەندێ کاری ژمێرياری بکەیت.

دوو ڕێگای سەرەکی هەیە بۆ دروست کردنی کوێری:

١-دروستکردنی کوێری بەرێگای DESIGN VIEW.
٢-دروستکردنی کوێری بەرێگای ویزارت SIMPLE QUERY WIZARD

یەکەم: دروستکردنی کوێری بەرێگای DESIGN VIEW.

بۆ دروستکردنی کوێری بەم ڕێگایە ئەم هەنگاوانە بگرە بەر:

١-یەک کلیک بکە لەسەر تەنی QUERIS.

٢-یەک کلیک بکە لەسەر NEW دوای ئەوە خانەی NEW QUERY دیتە سەر شاشە کە تیایدا بە پینج شت پیشان دەدات بۆ دروست کردنی کوێری. وێنەی (١).

٣-کلیک بکە لەسەرDESIGN VIEW و ئنجا کلیک بکە دوگمەی OK.

٤-خانەیەک دیتە سەرشاشە، داوای وەرگرتنی خشتەیەک وەک سەرچاوە بۆ




وێنەی (٢)

کویریەکە دەکات، یەک کلیک بکە لەسەر ناوی خشتەکە TBLBOOKS دوای ئەوە خشتەکە دێتە ناو بەشی سەرچاوەی داتا لە کویریەکە. وێنەی (٢)

٥-کلیک بکە لەسەر دوگمەی ADD بۆ وەرگرتنی خشتەکە.

٦-کلیک بکە لەسەر دوگمەی CLOSE.

٧-لەبەشی سەرەوەی کویری، لیستی ناوی کێلگەکانی خشتەکە دەردەکەوێت، بۆ دانانی هەرکێلگەیەک لە ناو کویریەکە: دوو کلیک بکە لەسەر ناوی کێلگەکە، یان لە جیاتی ئەوە نیشانەی ماوس بگوازەوە بۆ سەر ناوی کێلگەکەو رایبکێشە ناو بەشی خوارەوە کویری. وێنەی (٣)

٨- یەک کلیک لەسەر شێوەی X بکە بۆ داخستنی کویریەکە، نامەیەکی ئاگادارکردنەوەی دێتە سەر شاشە بۆ کۆگەکردنی کویریەکە، ئنجا بۆ کۆگەکردن یەک کلیک لەسەر دوگمەی YES بکە. وێنەی (٤)

٩- دوای ئەو خانەی ناونانی کویریەکە دێتە سەر شاشە، بەرنامەی ئەکسێس وەک دیفولت ناوێکی هەڵبژاردووە بەلام تۆ ئەو ناوە بسڕەوەو لە جیاتی ئەوە کویریەکەت ناوبنێ (QRYBOKKS) ئنجا یەک کلیک لەسەر دوگمەی OK بکە. وێنەی (٥).

دووەم: دروستکردنی کویری بەرێگای SIMPLE QUERY WIZARD.

بۆ دروستکردنی کویری بەم رێگایە ئەم هەنگاوانە بگرە بەر:

١-یەک کلیک بکە لەسەر تەنی QUERIS.

٢-یەک کلیک بکە لەسەر NEW دوای ئەوە خانەی NEW QUERY دیتە سەر شاشە کە تیایدا بە پێنج شت پیشان دەدات بۆ دروست کردنی کویری.وێنەی (٦)

٣-کلیک بکە لەسەر SIMPLE QUERY WIZARD و ئنجا کلیک بکە دوگمەی OK.

دوای ئەوە خانەی دەستنیشانکردنی ناوی خشتەکەو (سەرچاوەی داتا) و دەستنیشان کردنی کێلگەکانی ناو کویریەکە دێتە سەر شاشە. وێنەی (٧)

٥- لەژێر خانەی TABLES/QUERIES لیستەکە بکەوەو کە ناوی خشتەکان و کویریەکان وەک سەرچاوەی داتا تێدا دیاردەکەوێت، یەک کلیک لەسەر خشتەی TBLBOOKS بۆ هەڵبژاردنی وەک سەرچاوەی داتا، هەر دوای هەڵبژاردنی یەکسەر ناو هەموو کێلگەکانی خشتەکە لە ناو خانەی AVAILABLE FIELDS دەردەچێت.

٦- بۆ دەستنیشان کردنی ناوی کێلگەکان یەک کلیک بکە لەسەر ناوی کێلگەکە لەژێر خانەی AVAILABLE FIELDS و ئنجا کلیک بکە لەسەر دوگمەی > ناوی کێلگەکە ئەچێتە ژێر خانەی SELECTED FIELDS.

> : بۆ دەستنیشان کردنی ناوی کێلگەیەک.

< : بۆ سڕینەوەی ناوی کێلگەیەک لەژێر خانەی SELECTED FIELDS.

>> : بۆ دەستنیشان کردنی ناوی هەموو کێلگەکان.



وێنەی (٣)



وێنەی (٤)



وێنەی (٥)




وێنەی (٧)




وێنەی (٦)

<< : بۆ سڕینەوەی ناوی هەموو کێلگەکان.

تێبینی: هەموو کێلگەکان هەڵبژێرە.

٧- ئنجا کلیک بکە لەسەر دوگمەی NEXT . خانەیەکی تر دێت کە تەنها دوو خالی تێدایە، یەکەم: بۆ پیشاندانی هەموو داتاکانی ناو کوێریەکە وە خالی دووەم/ بۆ پیشاندانی SAMMARY پوختەی داتاکە. تۆ خالی یەکەم هەڵبژێرە (مایکرۆسۆفت ئەکسێس وەک دیفۆڵت خاڵی یەکەمی هەڵبژاردوە). وێنەی (٨).

٨- کلیک بکە لەسەر دوگمەی NEXT. ئنجا خانەی ناونانی کوێری دێت، مایکرۆسۆفت ئەکسێس خۆی ناوێک هەڵدەبژێرێت، بەڵام تۆ ناوەکە بسڕەوە کوێریەکەت ناوبنێ (QRYBOOKS1). وێنەی (٩).

٩- یەک کلیک لەسەر دوگمەی FINISH بکە.

دوای ئەوە یەکسەر کوێریەکە ئەکرێتەوە دێتە سەرشاشە. وێنەی (١٠)




وێنەی (٨)



وێنەی (١٠)




وێنەی (٩)

# ADOBE PREMIERE

ئامادەکردنی:
فەیسەڵ مەعروف

بەرنامەی ADOBE PREMIERE بەرنامەیەکی بەناو بانگی بواری دەستکاری و بەرهەم هێنانی ڤیدیۆیە، لە داهێنانی کۆمپانیای ADOBE ە، کە خاوەنی چەندین بەرنامەی تایبەت بە جیهانی دیزاین وێنەیە.

لەم زنجیرەیە هەوڵدەدەین بە شێوەیەکی پراکتیکی باسی ئەم بەرنامەیە بکەین بۆ دەرهێنانی فایلی ڤیدیۆی کە بابەتەکانی کۆکراوی فایلاتی (ڤیدیۆ و دەنگ)ی جۆراو جۆرە.

پاش دابەزاندنی بەرنامەی ADOBE PREMIERE بۆ سەر سیتەمەکە یەکەم جار کە بەرنامەکە دەکەیتەوە ئەوا PREMIERE ستایلی دەستکاری INITIL WORK SPACE دەکاتەوە ئەویش کە دوو هەڵبژاردەی تێدایە وێنەی (١):

١. ستایلی دەستکاری ئاسایی SELECT THE A/B EDITING .

٢. ستایلی دەستکاری پێشکەوتوو- SELECT THE SINGLE TRACK EDITING.




وێنەی (١)

ئێستا هەڵبژاردەی دووەم هەڵدەبژێرین کاری لە سەر دەکەین، دواتر باسی هەڵبژاردەی یەکەم: پاش هەڵبژاردنی هەڵبژاردەی دووەم پەنجەرەی LOAD PROJECT SETTINGS مان بۆ دەکرێتەوە وێنەی (٢ )، لە ڕێگای ئەم پەنجەرەیە دەتوانی تایبەتمەندی ئەو پرۆژەیە ی کە دەتەوێت بیکەیتەوە ڕێک بخەیت، دواتر لە لیستی AVAILABLE PRESETS (MULTIMEDIA VIDEO FOR WINDOWS ) کلیک دەکەین بۆ ئەوەی ببێتە سیستەمی دەستکاری کردن، سەیر دەکەین PREMIERE بە شێوەیەکی کورت تایبەتمەندی سیستەمی هەڵبژێراومان لە بەشی DESCRIPTION نیشان دەدات. لەم زانیاریانە سیستەمی پاڵەپەستۆی بەکار هێنراو و قەبارەی وێنەو ڕێژەی دیمەنەکان جۆری دەنگەکان دەخاتە ڕوو، ئینجا OK کلیک دەکەین ئەوا ڕووبەری سەرەکی بەرنامەی ADOBE PREMIERE مان بۆ دەکرێتەوە، وێنەی (٣).




وێنەی (٢)

بەشــە ســەرەکیەکانی رووبــەری بەرنامــەیADOBE PREMIERE پێــک هاتووە لە:

١) پەنجــەرەی پــرۆژەکان PROJECT وێنــەی(٤) : دەســت پێکــی کار لــەو پەنجەرەیە دەست پی دەکات، کە هەموو ئــەو بەشــانەی لــە پرۆژەکــەت بەکاری دەهێنیــت هەر لە فیلمی ڤیدیۆیی و دەنگ و هەروەهــا دروســتکردنی نووســین و شــێوەکان و زۆر لــە کاریگەریەکان کە بــۆ فیلمــی کۆتایی زیــاد دەکرێــت، ئەم پەنجەرەیــەش لــە چەنــد فەرمانێک پێک هاتووە کــە بــەزۆری بــەکار دەهێنرین ئەمانەی خوارەوەن:

١. فەرمانی گەڕانFIND
٢. دروســتکرنی ریبــەری نــاوەرۆک NEW BIN
٣. دروســتکردنی بەشــەکان CREATE ITEM
٤. ســڕینەوەDELETE SELECTED ITEMS
٥. ڕێکخســتنی قەبــارە و ڕووبــەری پەنجەرە RESIZE BIN AREA
٦. ئایکۆنەکانــی (٨،٧،٦ ) تایبەتــن بــە بینینی مادەکان بەشێوەی(ئایکۆن ICON و بچووککراوە THUMBNAIL، لیست LIST)ە.



وێنەی (٣)

٢) پەنجــەرەی مۆنیتــەر MONITOR وێنەی (٥):

ئەم پەنجەرەیە لە دووبەش پێک دێت:

١- پەنجەرەی SOURCE: بەکار دێت بۆ بینینی بەشەکان وەک خۆی جا بەشەکانی کتێبخانــەی پــرۆژە بێــت یا ئــەوەی لە پەنجــەرەیTIME LINE، ئــەم پەنجەرەیە توانــای پاڵفتــەو برینی بەشــەکانی هەیە لە پێش یا لەدوای خســتنە ناو بەرنامەی کۆتایی.

٢- پەنجــەرەی PROGRAM: تایبەت بە بینینی بەشــەکان کە هەر ئەویشە دەبێتە فلیمی کۆتایی.

هەروەهــا لەژێرەوەی ئــەم پەنجەرەیە گەلــێ فەرمانــی تــر هــەن کــە یارمەتی دەرن بــۆ گواســتنەوەو کۆنترۆڵ کردنی بەشــەکان هەر وەک لە خوارەوە باسیان دەکەین:

١. کاتی گشتی مادە
٢. لیستی مادەی ئاخنراو
٣. لیستی سەرچاوە
٤. نیشانەی گەرانەوەی سەرەتا
٥. نیشانەی گەرانەوەی کۆتا
٦. ئاخنین لە بەرنامە




وێنەی (٤)



وینەی (٥)

۷. ئاخنین لە سەر مادەی بەرنامەکە
۸. چونە سەر دیمەنی دەستکاری پێشوو
۹. چونە سەر دیمەنی دەستکاری دواتر
۱۰. زیادکردنی کاریگەری گواستنەوەنێوان دوو دیمەن
۱۱. دیمەنێک بۆ دواوە
۱۲. دیمەنێ بۆ پێشەوە
۱۳. وەستاندنی نیشاندان
۱٤. کار کردن
۱۵. نیشاندانی دووبارە
۱٦. دیاری کردنی ئامانجی دەستکاری
۱۷. برین بە جولاندن
۱۸.برین لە گەڵ جولاندنی تەنیشتی
۱۹. شوێنی هێلی دەستکاری

پەنجەرەی TIMELINEو ینەی (٦): پەنجەرەیکی سەرەکی بەرنامەی ADOBE PREMIERE ە: وپێک هاتووە لە:
۱. کەرەستەکانی (ادوات) دەستکاری
۲. بەدیار خستن و شاردنەوەی چین
۳. گەورە کردن و بچووککردنەوەی سەمپلی چینەکان
٤. ریکخستنی تایبەتمەندی چینەکان
٥. کار پێکردن و وەستاندنی سیستەمی راکێشانی لیوارەکان SNAP
٦. بینینی لێوارەکانی مادەی دەستکاری لە پەنجەرەی نیشاندان
۷. بە دوا داچونی گورانکاری لە هەر چینێک و جێ بەجیکردنی لە سەر چینەکانی تر
۸. لکاندن و هەلوەشانەوەی لکاندنی نێوان چینەکانی دەنگ وینە
۹. داخستنی چین
۱۰. چینی دەنگەکان



وینەی (٦)

١١. فراوان کردنی چینەکان
١٢. چینەکانی وێنەکان
١٣. ڕاستەی کات

بەرنامەی ADOBE PREMIERE چەندین ئەدەواتی یارمەتی دەر هەن کە کار ئاسانیمان بۆ دەکەن لە کاتی کار کردن لەم بەرنامەیە، پەنجەرەی ئەدەواتی یارمەتی دەری ١ وێنەی (٧) پێک هاتووەلە:

١. شاشەی نیشاندانNAVIGATOR : لە ڕێگای ئەم پەنجەرەیە دەتوانی پرۆژە جۆراو جۆرەکان ببینی بە شێوەیەکی خێراو ئاسان.

٢. تابلۆی زانیاری INFO: لە ناوەکەی دا دیارە گرنگی بە پێشکەش کردنی زانیاری وورد تایبەت بە کای ئێستا و فەرمانەکان کە جێ بە جێکراون.

٣. تابلۆیHISTORY: ئەم فەرمانە ڕێگا دەدات بە پیادا چوونەوەی هەنگاوەکانی کەوا جێ بەجێ کراون لە قۆناغەجیاکانی کارەکە، بۆ ئەوەی بتوانی پاشگەز بینەوە لە فەرمانێکی هەڵە.

٤. بچوکردنەوە
٥. گەورە کردن
٦. شوێنی هێلی دەستکاری




وێنەی (٧)

هەروەها چەند پەنجەرەیەکی یارمەتی دەر(٢) وێنەی(٨):

١. دانانی کاریگەریی لە نێوان دیمەنەکان TRANSITIONS: کە پەیوەستە بە کاریگەریی گواستنەوەی نێوان دیمەنەکان.
٢. کاریگەری ڤیدیۆ VIDEO FILTERS
٣. کایگەری دەنگAUDIO
٤. پۆلین کردن
٥. کۆی مادەکان
٦. گەران
٧. دروستکردنی فۆلدەر
٨. سڕینەوە

ئەم پەنجەرانەی کە لە سەرەوە باسمان کردن بە شێوەیەکی ستاندەر لە ڕووبەری شاشەی بەرنامەکە هەیە، لەگەڵ ئەوش چەندین پەنجەرەی ترن کە کەمتر بە کار دەهێنرێن،بۆ چونەسەر ئەو پەنجەرانەش لەکاتی پێویست دەچینە سەر لیستی WINDOW هەر پەنجەرەیەکمان بوێت ئەوا دەیهێنینە سەر شاشە. وێنەی (٩).




وێنەی (٩)




پەنجەرەی ئەدواتی یارمەتی دەر٢

وێنەی (٨)

# درێژەی زنجیرە بەرنامەی میدیا ستۆدیۆ پرۆ

ئا:فاخر محمود میرزا



وینەی (١)



وینەی (٢)

## چۆنیەتی دانانی جوڵە (Effect) لەبەرنامەی میدیا ستۆدیۆ پرۆ

وەک لەوانەکانی پێشوو ئاماژەمان بەو بەرنامەیە کرد کەوا چەند کارێکی زۆر گرنگ ئەنجام دەدات لەم بەرگەشدا هەوڵدەدەین کەوا کارێکی گرنگی لێ باس بکەین ئەویش چۆنیەتی دانانی جوڵە یان(EFFECT) ە لەبەرنامەی میدیا ستۆدیۆ بێگومان هەر وێنەیەک یان هەر پارچە ڤیدیۆیەک کەوا کاری مۆنتاجی لەسەر بکرێت ئەوا پێویستی بە جوڵە یاخود ئیفێکت دەبێت لەنێوانیان ئەم کارەش بەم شێوەیە ئەنجام دەدرێت سەرەتا بەرنامەکە دەکەینەوە لەسەرەوە لەلای راست لیستێک هەیە بەناوی PRODUCTION LIBRARY کەوا جوڵەکان تیایدا دیارە هەروەها لەژێر ئەودا نوسینێکی تر هەیە بەناوی TRANSITION EFFECT بەماوس کلیکی لەسەر دەکەین هەر لەم لیستەوە چەند نووسینێک زیاد دەبێت کەهەریەکەو تایبەتە بەکارێک بەم شێوەیە (وێنە ١) بەشی یەک و بەشی دوو هیچ کارێکمان پێیان نابێت بەڵام چوارەکەی کۆتایی گرنگن یەکەمیان TRANSITION EFFECT هەڵدەبژێرین بەماوس کلیکی لەسەر دەکەین دەبینین کە چەند جوڵەیەکی زۆر دەکەوێتە بەرچاو ئێستا ئەگەر بێت و دوو وێنە یاخود دوو پارچە ڤیدیۆ لەژێر یەک دابنێین و ئینجا جوڵەیەک هەڵبژێرین بێنینە ناوەراست دەبینین لیستێک پەیدا دەبێت پاش دانانی جوڵەکە بەم شێوەیە (وێنە ٢) ئینجا OK دەکەین دەبینین دووپارچە وێنەکە بەجوڵەیەکی جوان دەکەونە سەر یەکتر بەشی دووەمیان بریتیە لە MOVIG PATH ئەم جۆرەیان دەچێتە سەر وێنە یاخود ڤیدیۆ واتا جوڵەی یەکەم کە باسمان کرد دەچێتە نێوان دوو وێنە یاخود دووڤیدیۆ بەڵام ئەوەیان دەچێتە سەر دوو وێنە یاخود دوو ڤیدیۆ پاش ئەوەی جوڵەیەک هەڵدەبژێرن و بەماوسەکە جولکە دەهێنینە سەر ڤیدیۆ دیسان لیستێک پەیدادەبێت و OK دەکەین بەم شێوەیە (وێنە٣) ئەو جارە دەبینین وێنەکە بەتەواوی جوڵەکەی وەرگرتوە بەشی سێیەمیان بریتیە لە VIDEO FILTER ئەوەیان وەک بەشی دووەم کە باسمانکرد دەچێتە سەر ڤیدیۆکەو بەهەمان شێوە کارەکان دووبارە دەکەینەوە (وێنە ٤) وە ئەویتریشیان تایبەتە بە خۆشکردنی دەنگ.



وینەی (٣)



وینەی (٤)



وێنەی (١)

# جوڵەی BORIS - RED -V15

ئەو ئیفێکتە دەچێتە ناو بەرنامەی میدیا ستۆدیۆ وە زۆر جوڵەی (EFECT)ی جوان زیاد دەبێت لەناو میدیا ستۆدیۆ چۆنیەتی کارکردن پاش دابەزاندنی لەسەر کۆمپیوتەر بەرنامەی میدیا ستۆدیۆ دەکەینەوە لەلای ڕاست چەند جوڵەیەک هەیە کەتایبەتە بەمیدیا ستۆدیۆ وەک 3D FX FILM CLOCK PUSH هتد...

ئێمە دێین FX دەکەینەوە لەخوارەوەی جوڵەکان BORIS_RED زیادبوە بەم شێوە (وێنە ١) ئینجا گەر بمانەوێت جوڵەکە بخەینە نێوان دوو وێنە رایدەکێشین بۆنێوانیان لیستێک دێتە بەرچاو لەلای راست OPTIONS نوسراوە بەماوس کلیکی لەسەردەکەین لیستێکی تر دەکەوێتە بەرچاو بەم شێوەیە (وێنە ٢)

ئنجا FILE دەکەینەوە لەوێ کلیک لەسەر OPEN LIBRARY BROWSE دەکەین لیستێکی تر دەکەوێتە بەرچاو ئینجا KEYFRAME LIBRARY دەکەینەوە بەم شێوەیە (وێنە ٣) ئنجا هەر جوڵەیەکمان بوێت هەڵیدەبژێرین ئینجا OK دەکەین ئنجا لیستێکی تر دێت کلیک لەسەر APPLY دەکەین بۆ جێ بەجێ کردنی جوڵەکە(وێنە ٤).

# بەرنامەی Theme Maker




وێنەی (١)

ئا: اسحاق خالند

ئـەم بەرنامەیـە توانـای دروسـت کردنی پاشـکۆکانی سەرشاشـەی هەیە واتـا جوانـکاری چوارچێـوەو گۆڕینـی شـێوەیSTART و MY COMPUTER و RECYCLE BIN و هەروەهـا دەتوانـی وێنـەی خـۆت یاخـوت هەروێنەیـەک بەکاربێنـی بۆئـەو بەرنامەیـە چونیەتی کارکردن :

بەرنامەکـە دەکەینەوە ئنجـا لەرێگای IMAGE وە دێینـە سـەر LOAD MAIN IMAGE کلیکی لەسـەر دەکەی لیسـتێک دەکەوێتە بەرچاو بەم شـێوەیە (وێنە١) ئنجـا لیسـتی هـاردەکان دێتەبـەر چاو (وێنـە ٢) لەوێـوە دەتوانین ئـەو وێنەی پێویستمانە بێنینە ناوبەرنامەکە لەرێگای OPEN وە ئنجا لیسـتێکی تر دەکەوێتەوە بەرچاو کـە پێت دەڵێ دەتەوێ وێنەکەت بەتـەواوی دیـار بێـت یـان بەشـێکی دیاربێـت یەکەمیـان نوسـراوە CROP IMAGE و ئـەوی تریان RESIZE IMAGE TO FIT یەکەمیـان پێـت دەلی بەشـێکی لەوێنەکە دێنمە ناو بەرنامەکە دووەمیان دەڵێـت وێنەکـەت بەتـەواوی بـۆ دێنمە ناوبەرنامەکـە بـەم شـێوەیە (وێنـە ٣) ئنجا دەبینیـن کەوێنەکە بەجوانی هاتۆتە ناوبەرنامەکە واتا ئەو وێنە بەم شـێوەیە دەبێتە پاشکۆی سەرشاشەی کۆمپیوتەر (وێنە ٤) ئەم جارەیان دێین وێنەی دوەم دەسـت نیشـان دەکەین دیسان لەرێگای IMAGE وە دێیـن بەڵام ئـەم جارە دێینە سـەر LOAD MENU IMAGE کلیکـی لەسەر دەکەین دیسان لیستی هاردەکان دەبێتەوە دوبارە وێنەی پێویسـت دەست نیشان دەکەین و OPEN ی دەکەین بوناو

بەرنامەکــە دەبینین وێنــەی دووەم بۆتە START هــی یەکەمیان بۆتە پاشــکۆ بەم شــێوەیە (وێنە ٥) هەروەها لەلای راست دوو ئایکــۆن هەیــە لــەلای چەپیش یەک ئایکــۆن هەیە ئەوانە دەتوانیت بەکاربێنی بــۆ روناکــی و تاریکی وێنەکان پاشــان دیێت لەخوارەوە.

SAVE THEME هــەیە دەتــوانــی ئەوکارەی ئەنجامت داوە لەرێگای SAVE THEME هەڵی بگری بەڵام پێش ئەوەی SAVE بکەیت دەبێت ناوێکی بۆدیاری بکەیت ئەویش لەخوارەوەی بەرنامەکە بۆشاییەک دیارە شوێنی ناو نووسینە (وێنە ٦).



وێنەی (٢)



وێنەی (٣)



وێنەی (٤)



وێنەی (٥)



وێنەی (٦)

# درێژەی زنجیرەی Cooledit Pro

ئا: كاوه سلیمان

لەم بەرگـەدا باس لەچۆنیەتی هێنانی پارچـە ڤیدیۆیە بۆناو بەرنامـەی COOLEDIT بێگومـان وەک لەبەرگەکانی پێشـوش باسمان لەوەکرد کە ئەو بەرنامەیە لەکاری دەنگی بە بەهێزترین بەرنامـە دادەنرێـت لەجیهاندا وەباسـی ئەوەشـمان کرد کەلە زۆربـەی سـتۆدیۆکانی جیهان کار بـەو بەرنامەیـە دەکرێت بـەلام بەهێزی ئەوبەرنامەیە هەر لەدەنگ نیە بەڵکو لەرەنگیش سەرکەوتنێکی باشی بەدەست هێناوە فایلی جۆری AVI دەچێتە نـاوی لەسـەرەوەی بەرنامەکـە لەریزی فایـل INSERT هەیە کلیکی لەسـەر دەکەین چوارەم نووسـین VIDEO FROM FILE هەیە کلیکی لەسـەر دەکەین لیسـتی هاردەکان دەبێتەوە ئینجا ئـەو پارچە ڤیدیۆیـەی دەمانـەوێ OPEN ی دەکەین دێتە ناو بەرنامەکە بەمەرجێک دەبێت جۆری ڤیدیۆکە AVI بێت (وێنە ١)




وێنەی (١)

ئنجا ئەگـەر بمانەوێت دەنگێک لەگەڵ رەنگەکە لێک دەین دێینە سـەر فایـل لەوێـوە OPEN WAVE FROM FILE هەڵدەبژێریـن دووبـارە لیسـتی هـاردەکان دەبێتـەوە پاشـان ئەودەنگـەی پێویسـتمانە دێنینـە ناوبەرنامەکە لەرێگای OPEN وە پاشـان ئەگەر بمانەوێ SAVE بکەین لەناو بەرنامەکە لەسـەر ڤیدیۆکە بـەلای راسـتی ماوسـەکە کلیکێـک دەکەین لیسـتێک (وێنە ٢) دەبێتەوە لەسەرەوەی لیسـتەکە SAVE MIXDOWN TO VIDEO AS هەڵدەبژێریـن بەم شـێوەیەوێنە ٢ ئەگەر بمانەوێ بە MPG یاخـود بەهەرجۆرە فایلەک خەزنی بکەیـن ئەوکاتە OPTIONS کلیـک دەکەین پێش خەزن کردن پێمان دەڵێت بەچ شـێوەیەک خەزنی دەکەیت (وێنە٣).




وێنەی (٢)




وێنەی (٣)

# بەرنامەی Xara 3d بۆ دروستکردنی نووسینی جوڵاو وئارم

ئا: هاوکار رحمان

ئەم بەرنامەیە تایبەتە بەدروستکردنی نوسینی جوڵاو وئارمێکی جوڵاو.

ئەو کەسانەی لەبواری مونتاج کاردەکەن دەتوانن سوود لەم بەرنامەیە وەر بگرن.

ئەگەر سەرنج بدەین لەلای دەستە چەپەوە چەند هێمایەک دەبینین ئەو هێمایانە هەر یەکە کارێک دەکات ئەگەر بێت و پیتی T کلیک بکەین دەبینین پەنچەرەیەکمان دەداتێ ئەویش بۆ نوسینە ئەگەر بمانەوێ بنوسین COMPUTER دەبینین ووشەکە دەرچووە، (وێنەی ١).




وێنەی (١)

وەهەروەها پیتی E بۆ رەنگ کردن بەکار دێت بەئارەزووی خۆمان هەڵی دەبژێرین، وێنەی (٢)

پیتی U بۆ قالب کردنی نوسینەکە بەکاردێت ئەگەربمانەوێت قالبەکە بگۆرین ئەوا RECTARNGLE کلیک بکەو هەموو جۆرە قالبێک یاخود پشتی نووسینەکە بگۆرێ.

هەروەها پیتی B بۆ پان کردن بەکاردێت وە وشەی S بۆ سێبەر بەکاردێت و پیتی X بۆ جوانکاری نوسینەکە بەکاردێت (وێنەی ٣).

و پیتی A بۆ جوڵاندنەوەی نوسینەکە بەکاردێت ئەگەر بێت لەسەر پیتیA کلیک بکەین دەبینین چەند تیکستێکی خۆیمان دەداتێ کە چۆنیەتی جوڵانەوەمان دەداتێ




وێنەی (٢)



وێنەی (٣)


وێنەی (٤)

ئەگـەر بمانـەوێ دەسـت کاری بکەیـن دەچینە سـەر هێمایەکانی سوراو لەسەر هـەر کامێکیـان کلیک بکەین ئاراسـتەی جوڵاوەکە دەگۆرێت (وێنەی ٤).

ئازیـزان لەپـاش ئـەوەی کـە جۆری نوسـین و رەنگ و جوڵانەوە مان بەدڵی خۆمان ئامادەکرد ئنجا دەچینە سەر FILE کلیک دەکەین و دەچینە سـەر EXPORT ANIMATION (وێنەی ٥)

ئنجا دەمانەوێ سـەیڤی بکەین بەفایلی AVI ڤیدیـۆی و لەوشـوێنەی دەمانەوێ هەڵی بگرین دایدەنێین (وێنەی ٦).


وێنەی (٥)


وێنەی (٦)



وێنەی (١)

# بەرنامەیەک بۆ دروست کردنی حەوزی ماسی لە سەر ڕوکاری کۆمپیوتەرەکەت

بێستون عمر

پارێـزەری شاشـە زۆر بەرنامە هەن کـە دەتوانرێت لە ڕێگایانـەوە پارێزەری شاشـەی جـوان دروسـت بکەیـن بـەلام بەرنامـەی (AQUARIUMV11) حەوزێکـی زۆر جوان لەسـەر روکاری کۆمپیوتەرەکەت دروست دەکات لەسەر شێوەی حەوزێکی راسـتەقینە . کرداری دەسکەوتنی ئەم بەرنامەیە زۆر ئاسانە و دەتوانرێت بە خۆرایی بەدەسـت بکەوێت لـە ڕێـگای ئـەم لینکـەوە راسـتەوخۆ دەچیتە سـەر دابەزاندنـی ئەم بەرنامەیە (HTTP://WWW.SERENESCREEN.COM/DOWNLOAD/AQUARIUMV11.EXE) دوای دابەزانـدن دەتوانیـت راسـتەوخۆ دایمەزرێنیت ئینجا پێویستە سیریالەکەی بنوسـیت تاکـو نوسـینەکانی ریکلامـی کۆمپانیاکـە لادەچن . بۆ دانانی سـێرالی ئـەم بەرنامەیـە دوای دامەزرانـدن راسـتەخۆ وێنـەی ماسـیەک لـە سـەر شاشـەی کۆمپیوتەرەکـە دەردەکەوێـت کلیکی راسـتی لەسەر بکەو کلیک لەسەر (CONFIGURE) دوایی وەک لە وێنەی (١) دیارە لە شـوێنی خۆی ئـەم ژمارەیە(JOYIT22YITJOYITJOPPG) بنوسـەو دوایی کلیک لە سەر (OK) بکە، ئەم بەرنامەیە بە ئامادەکراویش بۆ ئەم گۆڤارە دابەزێنراوە بۆ زانیـاری زیاتر بڕوانە ئەم سـیدیەی لەگـەڵ ئەم ژمارەیە دایـە . جگە لەمەش دەتوانیـت هەر لەڕێـگای(CONFIGURE) رەنگی ماسـیەکان بگۆڕیـت بەئارەزوی خـۆت تا ئـەو رادەی دەتوانیـت بە تەنیا دەسـتکاری یەک ماسـی بکـەی بڕوانە وێنەی ژمارە (٢)، لە وێنەی ژمارە (٣) دا روکارێکی حەوزەکە نیشان دەدات .

# بەرنامەیەک بۆ گۆڕینی پەنجەرەی پشتەوەی هاردەکان

ئا. هەنێ محمد

بۆ زیاتر جوانکردنی کۆمپیوتەرەکەت و سەرسام کردنی ویندۆزەکەت ئەوا چەندان بەرنامە هەیە بۆرازانەوە یەکێک لەو بەرنامانە (تغییر خلفیة المجلدات) کە زۆر ئاسانە بەکاردێت بۆ گۆڕینی پەنجەرەی هاردەکان واتا دانانی وێنە بۆ رووبەری هاردەکانت وەک وێنەی (٢)

١- بەرنامەکە دەکەینەوە لە خانەی (مشغل الاقراص) ئەو هاردە دیار بکە کە دەتەوێ وێنەی پشتەوەی بۆ دابنێی هەروەها لە خانەی (استعراض الصور) ئەو وێنەیە بێنە کە دەتەوێ دای بنێیت هەروەها لەبەشی (لون الخط) رەنگی نووسینی فۆڵدەرەکان دیار بکە پاشان کلیک لەسەر قایل بوون(تغیر) بکە پاشان (OK) کلیک بکە لە کۆتایدا برۆ سەیری هاردەکەت بکە.











ئا: ئەژی عزیز







کاری ئـەم بەرنامەیـە گەڕانـە لـە نـاو ئەرشـیف ی کۆمپیوتـەر یـان فایل و فۆڵدەرەکانی ناو کۆمپیوتەر یـان لە ووشـەیەک لـە ناو نووسـراوەیەک یان کتێبێک دا، زۆر بـە خێرایـی و بـە ووردی شتەکە دەدۆزێتەوە، هەروەکو چۆن لە ئینتەرنێت بـە هۆی سـایتی گـۆگل لە ووشەیەک یان بەرنامەیەک دەگەڕێت

تێبینـی ئـەم بەرنامەیـە ڕاسـتە بـە نـاوی گۆگلـە بەڵام لـە هەمـان کاتدا ئەم بەرنامەیـە هیـچ پەیوەندی نیە بـە ئەنتەرنێتـەوە بۆیە دەتوانـی هـەر وەکـوو هەڵبـژاردەی سـیرچ کە لە ناو لیسـتی سـتارتدا هەیە بـەکاری بێنـی بـی ئەوەی دوا بکەوێـت لە دوزینەوەی فایلەکان یان فۆڵدەرەکان .

# بەرنامەی Overburn

ئا: هەڵمەت هاشم




ئـەم بەرنامەیە دەچێتە نـاو بەرنامەی نیـرۆ NERO بەهۆی ئـەم بەرنامەیەوە دەتوانیـن زیاتر لە ٨٠ دەقە کۆپی بکەین لەسـەر سـیدیک لەبەرئەوەی بەرنامەی نیـرۆ بۆخۆی ناتوانێ لـە٨٠ دەقە زیاتر کۆپـی بـکات بۆیـە دەبێـت لەرێـگای بەرنامەیێکـەوە ئـەم کارەی پـێ ئەنجام بدەین . بەرنامـەی OVERBURN دەچێتە سـەر نیـرۆ بەشـێوەیەک . بەرنامەکـە دەکەیتـەوە پاشـان بەمـاوس دووجـار کلیک لەسەر INSTALL دەکەیت و پاشان بەکیبۆرد ئینتەر دەکەی ئینجا بەرنامەکە دادەخەیت ئینجا دێـت و بەرنامەی نیرۆ دەکەیتـەوە لەسـەرەوە FILE دەکەیتەوە لەویـوە PREFRENCES هەڵدەبژێریت و ئەم لیسـتە دەکەویتە بەرچاو لەخوارەوە دوو بۆشـایی هەیە چەنـد ژمارەیەکیان لەناو نوسـراوە ژمارەکان بەم شـێوەیە دەگۆریـت هییەکەم دەکەیتـە (٠ ٠ ٨٠) هـی دوەمیان دەکەیتـە (٠ ٥٩ ١٢٠) بەم شـێوەیە ئینجا OK دەکەیت بەم شێوەیە نیرۆکـەت دەتوانـی لـە ٨٠ دەقـە زیاتر کۆپی بکات.

# بەرنامەی AVI_TO_MPG

ئا: سنور احمد




بێگومان زۆرجار ئێمە پێویستمان بە بەرنامەیەک دەبێت کە AVI بگۆرێت بۆ MPEG لەو کاتەدا بەرنامەی AVI_TO_ MPG پێویستیەکانمان بۆ پردەکاتەوە ئەوکارەمان بۆ ئەنجام دەدات بەرنامەکە زۆر سادەیەو پێویست بەدابەزاندن ناکات کارەکانیش زور بەجوانی و بەخێرایی ئەنجام دەدات بەشێوەیەک کە دیقەی ڤیدیۆکە تێک ناچێت واتا پاش گۆرانی AVI بۆ MPG هەر وەک خۆی دەمێنێتەوە بەرنامەکە دەکەینەوە لە سەرەوە دووبۆشایی هەیە لەتەنیش بۆشاییەکانیش دوو چوارگۆشە هەیە چوار گۆشەی یەکەم بۆهێنانی AVI یە وە چوارگۆشە خوارەوە بو دانانی فایلە کەیە کلیکی لەسەر چوارگۆشەکە دەکەین لیستی هاردەکان دەبێتەوە ئینجا ئەو شتەی پێویستمانە OPEN ی دەکەین دیتە ناو بۆشاییەکە پاشان CONVERT لێدەدەین پاش ژماردنی چەند چرکەیەک فایلەکە جۆری دەگۆری بۆ MPG بەم شێوەیە (وێنە١).

# بەرنامەی All Audio Converter بۆ گۆڕینی فایلی دەنگ

ئا: مەسعود میرزا




وێنەی (١)

بەهۆی ئەوبەرنامەیەوە دەتوانی فایلی جۆری WAVE بگۆری بۆ جۆری WMA MP3 VQF OGGهەروەها جۆری WMA ئەمرۆ زۆر پێویستە بۆ FLASH PLAER کەئەم جۆرە فایلە زۆر بچوکە دەتوانیت لەجیاتی MP3 دابنرێت لەبەر ئەوەی قەبارەی زۆربچوکترە چۆنیەتی کارکردن پاش دابەزاندنی بەرنامەکە لەسەر کۆمپیوتەر بەرنامەکە دەکەینەوە لەخوارەوە لەلای راست ADD WAVE نوسراوە کلیکی لەسەردەکەین لیستی هاردەکان دەبێتەوە ئنجا ئەودەنگەی پێویستمانە OPEN ی دەکەینە ناوبەرنامەکە پاشان START لێدەدەیت ئەم لیستە دەکەوێتە بەرچاو وێنە (١) پاشان CONVERT لێدەدەیت پاش ژماردنی چەند چرکەیەک ریندەرەکە تەواو دەبێت تێبینی: پێش ئەوەی دەنگەکە بێنیتە ناوبەرنامەکە جۆری فایلەکە دیاری دەکەیت ئەویش لەلای چەپ لەسەرەوە بەهێما نووسراوە وێنە (٢).




وێنەی (٢)




# بەرنامەی Xing Mp3 Encoder

ئا: هەژار عبدالرحمن

ئەوبەرنامەیــە تایبەتە بەگۆرینی دەنگ بــۆ MP3 زۆر جــار ئێمــە دەگەڕێین بۆ بەرنامەیــەک کەدەنگ بگۆرێت بۆ جۆری MP3 بەخێرایی و بەئاســانی بەڵێ XING MP3 ENCODER بەرنامەیەکــی زۆر ئاســان و خێرایــە بــۆ ئــەم کارە پــاش دابەزاندنی بەرنامەکە لەسەر کۆمپیوتەر بەرنامەکە دەکەینــەوە لەخوارەوە لەلای چــەپ ADD هەیە کلیکی لەســەر دەکەین لیســتی هاردەکان دەبێتەوە بەم شێوەیە (وێنــە ١) ئنجا ئەو دەنگەی پێویســتمانە OPEN دەکەیــن دێتــە نــاو بەرنامەکــە ئینجا ENCODER لێدەدەین راســتەو خۆ دەنگەکە دەبێتە MP3 دەچێتە ناو پرۆگرام فایل و ناو XING MP3 ENCODER




وێنەی (١)

# ناردن و وەرگرتنی فاکس لە ویندۆزی XP

ئامادەکردنی: کامەران خۆشناو
kameran 7605@yahoo.com

زۆر جار ئێمە پێویستمان بە فاکس دەبێت بۆ ناردنی بابەتێک بۆ شوێنێکی دیاری کراو، کەچی بە داخەوە بەدوای فاکس دەگەڕێین بۆ ناردنی بابەتەکە، کەچی ویندۆزی XP پێویستی بە هیچ بەرنامەیەکی تایبەت بە فاکس نییە، چونکە ویندۆزی XP خۆی فاکسی تیایە، واتە ئەگەر تۆ لەسەر ویندۆزی XP کاردەکەیت ئەوا بێ گومان بە کەتۆ خاوەنی فاکسیت .

## ڕێگای بەکارهێنانی فاکس لە ویندۆزی XP

بڕۆ بۆ لیستی START وە دوایی CONTROL PANEL وە دیاری کردنی PRINTERS AND FAXES پاشان لە چەپەوە SETUP FAXING دیاری بکە، دەبینین ویزاردی دانانی فاکس دەکرێتەوە، وە زانیارییەکان بنوسە وەکو ناوو ژمارەی فاکس (واتە ژمارەی تەلەفۆن) وە هەندێ زانیاری تر کە لەگەڵ فاکسەکە ئەڕوات بۆ ئەو کەسەی کە بۆی ئەنێری، دوایی دەبینین ئایکونی فاکس دروست دەبێت (وێنەی ژمارە١)، و کلیکی ڕاستی ماوسی لەسەر ئەکەین وە PROPERTIES هەڵدەبژێرین، و لەبەشەکانی سەرەوە DEVICES دیاری دەکەین، و پاشان PROPERTIES ولەسەرەوە RECEIVE دیاری دەکەین، و نیشانەی ڕاست لە چوارگۆشەی ENABLE DEVICE TO RECEIVE دەدەین (وێنەی ژمارە ٢)، بۆ

ئەوەی بەرنامەکە کار بکات وە پێشوازی لە فاکسەکان بکات، وە لە ANSWER MODE دوو هەڵبژاردن هەیە، یەکەمیان MANUAL واتە لەکاتی گەیشتنی فاکس ئایکۆنی فاکس بەدیار دەکەوێت، وە ئەتوانی تەلەفۆن بەکاربهێنی بە شێوەیەکی سروشتی، دووەمیان AUTOMATIC واتە پێشوازی کردنی فاکس لەکاتی قسەکردن بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی، وە ناردنی فاکس زۆر ئاسانە ئەویش لەهەر بەرنامەیەکی نووسین بێت یاخود بەرنامەیەکی وێنەیی، ئەگەر وێنە بنێریت، دەچین بۆ PRINT وە لەتایبەتمەندییەکە FAX دیاری دەکەین وەکو پرێنتەرەو OK دەکەین، دەبینین بەرنامەی فاکس ئیش دەکات وە داوای تەنها ژمارەی فاکسی ئەو کەسەت لێدەکات کە فاکسەکەی بۆ دەنێریت (وێنەی ژمارە ٣)، وە لە کۆتاییدا FINISH دەکەین وە فاکسەکە بە شوێنی مەبەست دەگات.

Standard 300 bps Modem

Send | Receive | Cleanup

Specify settings for receiving faxes

دیاری کردنی ئەم خانەیە

Enable device to receive

The Called Subscriber Identification (CSID) identifies you as a fax recipient, and is transmitted by a device when you receive an incoming fax. The CSID usually consists of a fax number, and business name.

CSID: Fax

Answer mode:

Manual

Automatic after 2 rings

When a fax is received:

Print it on:

Save a copy in folder:

Successfully received faxes are stored in the Inbox archive of Fax Console. Choose this option to save an additional copy of the fax in the folder specified.

OK | Cancel | Apply

وێنەی (٢)

Send Fax Wizard

**Recipient Information**

Enter the name and number of the person you want to send the fax to, or click Address Book to select a fax recipient.

To: 1 نووسینی ناوی کەسەکە

Address Book...

دەفتەری ناونیشان

Location: Iraq (964)

Fax number: ( ) نووسینی ژمارەی فاکس

Use dialing rules | New Location | Dialing rules

To send to multiple recipients, type each recipient's information above, and then click Add to add the recipient to the list below.

| Recipient name | Fax number |
| --- | --- |

Add | Remove | Edit

< Back | Next > | Cancel

وێنەی (٣)

# چۆنیەتی داخل کردنی تراکی دەنگ بۆ ناو کۆمپیوتەر

ئا: گۆران سلێمان




وێنەی (١)

ئەم کردارە دەتوانێت بەچەند شێوەیەک ئەنجامی بدەیت وەکوو ویندۆز میدیا پلەیەر و بەرنامەی نیرۆ و چەند شتی تر بەلام ناتوانی راستەو خۆ تراکێکی دەنگ بخەیتە ناو کۆمپیوتەر یان گۆرانیەکی دەنگ لەبەرئەوەی پاش داخیل کردنەکە ئەگەر بێت و تراکەکە بکەینەوە دەبینین کار ناکات لێرەدا باسی بەرنامەی نیرۆ NEROدەکەین کەدەتوانیت تراکێکی دەنگ بخاتە ناو کۆمپیوتەر لەهەمان کاتدا تراکەکە کاربکات.

## چۆنیەتی کارکردن

سەرەتا باس لەو بەرنامەیە دەکەین کەچەند مۆدێلێکی هەیە واتا VERSIONێکی کۆن و نوێی هەیە بەلام بەلام ئەو کارەی ئێمە باسی دەکەین لە ڤێرژنی نوێ و کۆن جیاوازیکی زۆی نیە بۆنمونە ڤێرژنە کۆنەکان ونوێکان پاش کردنەوەیان لەسەرەوەی بەرنامەکە چەند نوسراوێک هەیە وەک FILE - EDIT- VIEW -RECORDER- EXTRAS - WINDOW -HELP (وینە ١) سەرەتا بێین باس لە نیرۆ ڤێرژنە کۆنەکان بکەین دینە سەر RECORDER کلیکی لەسەر دەکەین بەماوس لیستێکی نوێ دەکەوێتە بەرچاو بەم شێوەیە (وێنە ٢).

هەر لەم لیستەوە لیستێکی تردێت کەئەمانەی تێدا نووسراوە CHOOSE RECORDER - MEDIUM-INFO - SAVE TRAKS و هتد. بەماوس کلیک لەسەر SAVE TRAKS دەکەین دولیستی جیاواز



وێنەی (٢)



وێنەی (٣)

لەدوو یەکتر دێن هەردووکیان بەماوس لادەبەین تاکو ئەم لیستە دەکەوێتە بەرچاو (وێنە ٣) بەڵام لەکاتی ئەنجامدانی ئەم کارانە دەبێت سیدییە دەنگەکە لەسەر سیدی رۆم بێت ئینجا هەموو تراکەکان دەکەونە بەرچاو وەک لە وێنە ٣ دیارە ئینجا کام تراک مان بوێت دەست نیشانی دەکەین ئینجا GO لێدەدەین تراکەکە دەچێتە ناو کۆمپیوتەر هەروەها لەبۆشایەکەی خوارەوە پێت دەڵێ بەچی جۆرە فایلێک دەنگەکان خەزن دەکەیت (وێنە ٤).




وێنەی (٤)

# دابەش کردنی کاتی بەکارهێنانی کۆمپیوتەر بەسەر منالەکانتدا لەمالەوە

ئا: باوکی عەلی

ئەم بەرنامەیە زۆر بەهێزە بۆ کۆنترۆل کردنی کۆمپیوتەر لە مالەوە بۆ منالەکان بۆ ئـەوەی گیروگرفت لە نێوان منالەکان بـە هیچ شـێوەیەک دروسـت نەبێت، لە رێگـەی ئـەم بەرنامەیـە دەتوانیت کات بۆ منالەکان تەرخـان بکەیت، بۆ نموونە منالی یەکەم لـە کاتژمێر ٦:٠٠ ی ئێوارە بـۆ ٧:٠٠ ئێـوارە ئەوەی تریـان لە ٧:٠٠ تاوەکو ٨:٠٠ ی ئێوارە.

دەتوانیت کۆنترۆل کردن بۆ ئەنتەرنێت بێـت بۆ ئـەوەی بـە بەکارهێنانـی کاتی جیـاواز هەریەکەیان بـەکاری بهێنن یان بـۆ کۆمپیوتـەر بێت، هیچ لـە منالەکان ناتوانن کاتی ئـەوەی تریان بەکار بهێنن یان لە کاتی خۆی زیاتر دابنیشیت لەبەر ئـەوەی فەرمان دەداتـە کۆمپیوتەر پاش تەواو بوونی کات کۆمپیوتەر بکوژێنتەوە یان لاپەرەکانی ئەنتەرنێت بلۆک بکات.

Aye Parental Control

- For Windows 98/Me/2000/XP.
- Limit the time to access PC/Internet.
- Block specified programs and websites.
- Monitor Internet activities.

چونیەتـی بەکارهێنانـی، سـەرەتا بەرنامەکـە بکـەرەوە یەکەم جـار ناو و ووشـەی نهێنی بۆ کەسـی یەکەم دابنێ بـە کلیک کردن لەسـەر دووگمەی ADD USER سـەیری وێنـەی AYE 2 بکە پاش کلیک کردن ویندۆیەک دەکرێتەوە سەیری وێنـەی AYE PASS، پـاش زیـاد کردنی هەموو ئەو کەسانەی بەشداری دەکەن لە بەکارهێنانی ئەم کۆمپیوتەرە، ئێستا کات بۆ هەریەکەیان دەست نیشان بکە ئەویش بە کلیک کردن لەسەر ناوی هەر کەسێک لە لیسـتی دەسـتی چەپ لای سـەرەوە وەک لـە وێنەی AYE 2 دا دیارە پاشـان لەسـەر دووگمەی ADD RULE کلیک بکە و ویندۆیەک دەکرێتەوە سـەیری وێنەی AYE 1 بکـە لێرەدا دەتوانیت ئەم کەسـە کۆمپیوتـەر بەکار بهێنیت بەم شـێوەیە، هەمـوو رۆژ EVRY DAY یـان هەفتانـە WEEKLY لە هەفتەشـدا دەتوانیت هەموو رۆژەکان یان دوو رۆژ یان هەر رۆژێک مەبەسـت بێـت کـەوا نـاوی رۆژەکان نووسـراوە، یـان بـە دانانـی بەروارێک دیـاری کراو THE DAY بۆ نموونە لە ٨-٩-٢٠٠٥ تـاوە کـو ٢٠-٩-٢٠٠٥، ئەوانە هەمویان لە بەشی BASED ON دادەنرێت پاش دادنانی ئەم مەرجە برۆ سەر بەشی SETPC/INERNET OFF-TIME هـەر لـە هەمان لاپەرە بۆ دەسـت نیشـانی کاتی دیـاری لەرۆژێکـدا بـۆ نموونـە لە کات ژمێر ١٠ی بەیانـی تاوەکو ١٢ی نیوەرۆ ئەگەر بەم شـێوە دابنـرێ ئەوە بۆی نیە جگە لەو کاتە کاتێکی بەکاربهێنێت، بەلام ئەگەر ئەوەی تریان هەلبژێری بۆ نموونە ٦ کاتژمێـر ئەوا لەم رۆژەدا هەر کاتێکی بێـت دەبێت، هەروەها دەسـت نیشـانی ئـەوەش دەتوانـی بکەیـت پـاش تەواو بوونی کات کۆمپیوتەر بکوژێتەوە، ئەگەر RESTRICT COMPUTER ACCESS

Aye Parental Control

Rule Name
Define a rule name to identify.

Based on
Everyday
Weekly Mon Tues Wed Thur
Fri Sat Sun
The day 9 - 7 -2005 (MM-dd-yyyy)

Set PC/Internet off-time
From 01 : 30 to 21 : 59 (hh:mm),
Allow 19 hrs 00 mins Per Day, when time runs out,
restrict computer acces: autoshutdown

OK Cancel

هەلبژێری ئەوە بۆ کۆمپیوتەرە و واتە ئەنتەرنێتیش سەربەست دەبێت بەلام ئەگەر RESTRICT INTERNET ACCESS هەلبژێری ئەوە بۆ کۆمپیوتەر سەربەست دەبێت بەلام بۆ ئەنتەرنێت بە پێ یاسا دەبێت.

بۆ لادانی هەر کەسێک کلیک لەسەر DELETE USER بکە، بۆ دەست کاری کردنی یاسای تایبەت بە هەر کەسێک بۆ بەکار هێنانی کۆمپیوتەر کلیک لەسەر EDIT RULE بکە، بۆ لادانی یاسا DELETE RULE بەکار بهێنە.

تێبینی: بۆ دامەزراندنی بەرنامەکە دوو جار کلیک لەسەر فایلی تایبەت بە SETUP کردنی بەرنامەکە بکە بۆ نموونە ناوی فایلەکە APC پاش کۆتایی هاتن بە دامەرزاندن بەرنامەکە بکەرەوە و کلیک لەسەر دووگمەی REGISTER بکە هەروەک لە وێنەی AYE 2 دا دیارە، ویندۆیەک دەکرێتەوە وەک لە وێنەی AYE RE دا دیارە ئەم بەرنامەیە بۆ ماوەی ١٥ رۆژ کاردەکات بەلام کلیک لەسەر REGISTER بکە دوو بارە ویندۆیەکی تر دەکرێتەوە وەک لە وێنەی AYE CODE دیارە USERNAME و REGCODE داخل بکە، بۆ ئەوەی بەرنامەکە ئەم مەرجەی ١٥ رۆژەی لابدات ببێتە دائیمی، بەلام مەرجە هێلی ئەنتەرنێتت هەبێت بۆ لادانی ئەم مەرجە.

USERNAME: ENGLISH.P30WORLD.COM

REGCODE: RFTCKOFJKKLAJFTXFAZKLXJTF















وێنەی (١)

# زانیاریەک لە temp ویندۆزی xp

**ئامادەکردنی: ژینۆ محمود**

ئازیزان ئاشکرایە کە ئێمە ڕۆژانە کار لەسەر کۆمپیتەر دەکەین بۆ ئەوەی کارەکانمان بۆ ڕاپەڕێنێت جێ بەجێ بکات، لەگەڵ ئەوەشدا سیستەمی ویندۆز کە هەرکارێک ئەنجام بدات ئەوا لەناوەی خۆی پاشماوەی کارەکان هەڵدەگرێ بۆ ماوەیەکی کاتی واتە فایلی (TEMP)، بەڵام ئەم پاش ماوەیە کاردەکاتە ویندۆزەکە وادەکات ویندۆزەکە لەسەرەخۆ کاربکات بۆیە دەبێ فرێی بدەین، بەڵام لەویندۆز XP دا ئەم پاش ماوانە دەچێتە شوێنێکی ترەوە ئەویش فایلی PREFETCH بۆیە من ئاگەدارتان دەکەمەوە کەڕۆژانە هەڵسن بەفرێدانی پاشماوەکان لەگەڵ من بن بەم هەنگاوانە

یەکەم جار دەچینە MY COMPUTER دەکەینەوە (وێنەی ١).

دووەم جار دەچینە بەشە هاردی (C) دەکەینەوە (وێنەی ٢).

سێیەم جار دەچینە سەر فایلی WINDOWS دەکەینەوە (وێنەی ٣).

چوارەم جار دەچینەسەر فایلی (PERFETCH) دەکەینەوە (وێنەی ٤).

لەپاشان هەمووی نیشان SLAECT ALL دەکەین لەدوایدا ڕەشی دەکەینەوە DELETE دەکەین، وێنەی (٥).



وێنەی (٢)

# کارکردنی پۆستی ئەلیکترۆنی لەگەڵ بەرنامەی outlook

ئامادەکردنی: ک. خۆشناو
KAMERAN7605@YAHOO.COM

بەڕێزان بەرنامەی OUTLOOK EXPRESS یەکێکە لە بەرنامە پاشکۆییەکانی بەرنامەی INTERNET EXPLORER، کە کۆمپانیای مایکرۆسۆفت دەری دەکات، کە هەڵدەستێ بە ڕێکخستنی ناونیشانی پۆستە ئەلیکترۆنیە جیاوازەکان، بۆ جێبەجێ کردنی ئەم کارە یەکەم جار هەڵدەستین بەکردنەوەی بەرنامەکە، وە بەرنامەکە دەچینە سەر شاشەی ویزاردی بەرنامە، کە لە هەنگاوی یەکەمدا داوای نووسینی ناوێک دەکات کە لەکاتی ناردنی نامەکان بەدیار دەکەوێت (وێنەی ژمارە ١)، دوایی NEXT کردن دەڕۆین بۆ هەنگاوی دووەم کە داوای نووسینی ناونیشانی ئیمەیلەکە دەکات (وێنەی ژمارە ٢)، دوایی NEXT کردن دەچین بۆ هەنگاوی سێیەم ئەویش بە نووسینی جێبەجێکاری ناردن و وەرگرتنی سایتی پۆستەکە کە ناونیشانی ئیمەیلەکەیە (وێنەی ژمارە ٣)، کاتێک لەم هەنگاوە تەواو بووین ئەوا چیمان نامێنێ تەنها بە نووسینی ناوی بەکارهێنەر و ووشەی نهێنی لە هەنگاوی چوارەم (وێنەی ژمارە ٤)، وە ئەوەی گرنگە بیزانین ئەوەیە کەئەم بەرنامەیە دەتوانێت بە چەندین ناونیشانی ئیمەیل گرێ بدرێت، وە هەروەها بۆ دەست بەسەراگرتنی ڕێکخستنی نامەکان بە زیادکردنیان یاخود ڕەش کردنەوەیان یان دەستکاری کردنیان، ئەوا لەڕێی لیستی TOOLS ەوە دەکرێت لە فەرمانی ACCOUNTS (وێنەی ژمارە ٥)،

وێنەی (١)

وێنەی (٢)

Internet Connection Wizard

Internet E-mail Address

Your e-mail address is the address other people use to send e-mail messages to you.

E-mail address: kameran7605@yahoo.com

For example: someone@microsoft.com

ناونیشانی ئیمەیڵەکە لەم خانەیە دەنووسین

< Back | Next > | Cancel

وێنەی (٣)

**بەناوبانگترین جێبەجێ کارییەکانی بەخشینی ناونیشانی ئیمەیڵ لە بەرنامەی OUTLOOK EXPRESS**

پۆستی NASEEJ
جێبەجێکاری ناردن SMTP.NASEEJ. COM
جێبەجێکاری وەرگرتن POP.NASEEJ. COM

پۆستی GAWAB
جێبەجێکاری ناردن SMTP.GAWAB. COM
جێبەجێکاری وەرگرتن POP.GAWAB. COM

پۆستی MAKTOOB
جێبەجێکاری ناردن MAKTOOB.COM
جێبەجێکاری وەرگرتن MIRA٠ MAKTOOB.COM

پۆستی ARABIA
جێبەجێکاری ناردن MAIL.ARABIA. COM
جێبەجێکاری وەرگرتن MAIL.ARABIA. COM

پۆستی HOTMAIL
جێبەجێکاری ناردن HSTMP.HOTMAIL. COM
جێبەجێکاری وەرگرتن POP.HOTMAIL. COM

پۆستی YAHOO
جێبەجێکاری ناردن SMTP.MAIL. YAHOO.COM
جێبەجێکاری وەرگرتن POP.MAIL. YAHOO.COM

پۆستی FLASH MAIL
جێبەجێکاری ناردن MAIL.FLASHMAIL. COM
جێبەجێکاری وەرگرتن MAIL. FLASHMAIL.COM

پۆستی TELEBOT
جێبەجێکاری ناردن SMTP.TELEBOT. COM
جێبەجێکاری وەرگرتن POP.TELEBOT. COM

پۆستی POLBOX
جێبەجێکاری ناردن SMTP.POLBOX. COM
جێبەجێکاری وەرگرتن POLBOX. COM

پۆستی CROSSWINDS
جێبەجێکاری ناردن MAIL. CROSSWINDS.NET
جێبەجێکاری وەرگرتن POP. CROSSWINDS.NET

پۆستی HOTPOP
جێبەجێکاری ناردن SMTP.HOTPOP. COM

جێبەجێکاری وەرگرتن .POP.HOTPOP COM
پۆستی SOFTHOME
جێبەجێکاری ناردن.SMTP.SOFTHOME NET
جێبەجێکاری وەرگرتن.POP SOFTHOME.NET
پۆستی ABCFLASH
جێبەجێکاری ناردن .MAIL.ABCFLASH NET
جێبەجێکاری وەرگرتن.MAIL ABCFLASH.NET

لە کۆتاییدا خاڵێکی گرنگ هەیە کە دەبێ بیزانین ئەمیش ئەوەیە کە ئەم کارە دەبێتە هۆی ئەوەی کە نامەکان راستەوخۆ دابەزنە ناو ئامێرەکە، لەبەرئەوە بوونی هەر ڤایرۆسێک دەبێتە هۆی تێکدانی ئامێرەکە، لەبەرئەوە دەبێ بەرنامەیەکی دژە ڤایرۆس بەکاربهێنرێت کە بگونجێ لەگەڵ بەرنامەی OUTLOOK EXPRESS وە زوو زوو نوێ بکرێتەوە، وەکو بەرنامەی ANTI VIRUS .


وێنەی (٤)


وێنەی (٥)

# چۆن ئامێرەکەت پاک دەکەیتەوە لە فایلاتی سیخوڕی batch؟

ئامادەکردنی / گۆران شەقلاوەیی
Goran2005@yahoo.com

BATCH یـان ترۆجان (TROJAN)یاخود ئەسـپی تەڕوادە، هەموویان بەیەک مانا وە بەیـەک ئامانـج بریتییە لـە مەلەفێک یاخود بەرنامەیەکی شاراوە لەناو ئامێری کۆمپیوتـەر، کە لەڕێیەوە کەسـی هاکەر دەتوانێ بگات بە پێکهاتەکان و مەلەفەکان و ناوەڕۆکی ئامێرەکەت، و یاری کردن بە سیسـتەمەکەو پێکهاتەکانی، بە مانایەکی تر واتـە دزە کردنە نێو ئامێرەکەت بۆتە کارێکی زۆر ئاسـان، بەهۆی بوونی ئەم جـۆرە مەلەفـە (BATCH)، ئـەوەی ئێمـە دەمانەوێ باسـی بکەین، چۆن بزانین کە ئامێرەکەمان مەلەفێکی لەم جۆرەی تیایە؟ وە چۆن لای بەرین بۆ ئەوەی کەسـانی هاکەر سوودی لێ نەبینن ؟ .

دوو ڕێـگا هەیـە بۆ ئەنجـام دانی ئەم کارە، یەکێکیـان لـە ڕێـی دۆسـەوە، و دووەمیـان لە ڕێی فەرمانی RUN ەوە لە ویندۆز .

١. لـە دۆس ئەم فەرمانە دەنووسـین C:\WINDOWS\DIR PATCH بۆ ئەوەی بە دوای مەلەفی BATCH بگەڕێ، دوای ئەمە ENTER بکـە، ئەگـەر ئامێرەکەت مەلەفی BATCH ی دۆزیـەوە هەڵسـە بە لابردنی بـەم شـێوەیە C:\WINDOWS\DELETE PATCH. .

٢. ڕێـگای دووەم لـە لیسـتی START دەچین بۆ RUN وە دەنووسین REGEDIT، و لەشاشـەی REGEDIT یـەک بـەدوای یـەک ئەمانـە هەڵدەبژێریـن، _HKEY LOCAL_MACHINEدوایـی SOFTWARE پاشان MICROSOFT پاشان WINDOWS و لەدوایـی CURRENT VERSION هەڵدەبژێریـن، دوای ئەمـە لیسـتێکی درێژمان پیشـان دەدات، ئـەوەی بەلای ئێمەوە گرنگە تەنها سێ فۆڵدەرن، ئەمانیش (RUN.RUN ONCE.RUN SERVICE )، وە لەهـەر یەکێکیـان بەدوای ئـەم مەلەفانە بگـەڕێ PATCH.EXE یاخـود EXPLO32 یاخود SERVER.EXEC یان WINDOWS\ EXPLO32.EXE یاخود EXPLORER32، و لەهەر یەکێکیان ئەم مەلەفانەت دۆزیەوە هەڵسە بە لابردنی، لە ڕێی کلیکی ڕاستی مـاوس وە هەڵبژاردنـی DELETE، دوای ئەمە ئامێرەکە RESTART بکەرەوە، وە بە پشتیوانی خودا ئامێرەکەت پاک دەبێتەوە لە مەلەفاتی سیخوڕی .



## بەڕێز هەڵکەوت جەمال عەلی

# قۆناغی دووەمی سیستەمی کارمان لەدەورو بەرو شارۆچکەکان دەست پێ دەکات

دیمانە: ڕێناز حەویزی



بەمەبەستی ئاشنابوونی خوێنەران و بەکارهێنەرانی هێڵی ئەنتەرنێت لەڕێگای ئاریافۆنەوە بۆ زانینی چۆنیەتی سیستەمی کارکردن و پرۆژەی نوێ لەکۆمپانیای ئاریا فۆن چەند پرسیارێکمان ئاراستەی بەڕێوەبەری کارگێری ئاریافۆن کرد .

پ/ئایا ڕێژەی بەژداربوانی هاوڵاتیان بۆ بەکارهێنانی هێڵی ئەنتەر نێت لەکۆمپانیای (ئاریافۆن) چەندە ؟

و/ تاکوئێستا ڕێژەی بەژداربوان گەیشتۆتە (حەوت هەزار) کەس کەئەمە قۆناغی یەکەمی سیستەمی کارکردنمان بوو وەقۆناغێکی تریشمان لەپێشە واتە بۆقۆناغی دوەمی سیستەمی کارکردنمان بەمەبەستی فراوان کردنی تۆڕی ئەنتەر نێت ئێمە تاکو ئێستا لەناوەند بوین بۆلەمەودوا لەدەورو بەرو شارۆچکەکان دەست پێ دەکەین وەک (خەبات، بنەسلاوە، دارە توو، قوشتەپە، کەسنەزان، مەصیف) ناوچەی بەرانەتی هەموو دەگرێتەوە، دەستمان پێ کرد بەگەیاندنی هێڵی تەلەفۆن پاش ئەوەی تەلەفۆن دابەش کرا دوایی دەست پێ دەکەین بەدابەش کردنی تۆڕی ئەنتەر نێت .

پ/ئایا هیچ گرێبەستێک هەیە لەنێوان کۆمپانیا کەتان لەگەڵ کۆمپانیاکانی دەرەوە بۆ بەهێزکردنی هێڵی ئەنتەرنێت؟

و/چەند گرێبەستێک هەیە لەگەڵ کۆمپانیاکانی جیهانی دەرەوە بۆ خزمەتگوزاری تەلەفۆن و ئەنتەرنێت گرێبەستێکی فاکسیش لەبەر دەست دا هەیە بەڵام جارێ تەواو نەبووە بۆتەلەفۆن و ئەنتەرنێتیش لەگەڵ چەند کۆمپانیایەکی دەرەوە کەخزمەتگوزاریەکان ڕاستەو خۆ بێت تۆڕی ئەنتەر نێتی تایبەت بەخۆمان بەتۆڕێکی سەربەخۆ بەتۆڕەکانی ئەنتەرنێت ببەستینەوە مەبەستمان لەم کارە بۆ ئەوەی بەیەک بەستنەکان ڕاستەوخۆ بێت لەگەڵ کۆمپانیاکانی دەرەوە واتا بۆبەستنەوەی تۆڕی ئەنتەرنێت پێویست بە وێستگەی ناوەندی نەکات بەڵکو ڕاستەوخۆ بێت .

پ/ سیستەمی بەکارهێنانی ئەنتەرنێت لەلای ئێوە چۆنە ؟

و/ سیستەمی ئەنتەرنێت لێرە (VOICE CHANEL ) لەهەر شوێنێک قسەکردن گفتوگۆ هەبێت لەپێشینەی هەمویانە ئەنتەرنێت ڕیزبەندی دووەمە هەندێک جار لەهەندەک شوێن بۆماوەیەکی کورت کاریگەری لەسەر خێرای بکات سیستەمەکە (VOIC CHANEL) واتا بەم سیستەمە دەنگی یە کاردەکات بۆ یە هەندەک لەم هۆیانە کاردەکاتە سەر هێڵی ئەنتەرنێتەکە بۆیە ئێستا بەنیازین لەچەند جێگایەک لە هەولێر کە هێڵی تەلەفۆنی زۆرە پێویستمان بە تاوەراتی زیادە هەیە تاکو ئەوشوێنانەی کەتۆڕی ئەنتەرنێت نایانگرێتەوە وایان لێ بێت کەهێڵی ئەنتەرنێت بگرێتەوە .

پ/پرۆژەی نوێتان لەبەردەست داهەیە؟

و/ پرۆژەی نوێ دەمانەوێ ئەنتەرنێت لەگەڵ تەلەفۆن چەناڵی ئەنتەرنێت جیا بکەینەوە واتا مۆدیمێک دابنێن وایەر لێس بێت سەربەخۆبێت بەجیا واتا تەلەفۆنەکە بەجیا بێت ئەنتەرنێتەکە بەجیا بێت ئەم پرۆژە بۆلەمەوودوا دەست بەکار دەبێت و کاری تێدا دەکرێت.

# دنیایی مۆسیقا لەگەڵ تەکنەلۆژیایی سەردەم

بەهۆیی تێکەڵ بوونی کۆمپیوتەرو ئەنتەر نێت لەزۆربەی بوارەکانی ژیانی ڕۆژانە جۆرە سیمایەکی نوێ خواز و نوێ بابەتی هێناوەتە کایەوە بۆزۆربەی زۆری کارەکانی ڕۆژانە .دنیایی مۆسیقاش بێ بەش نیە لە بەکارهێنانی ئەم ئامێرە پێشکەوتوە،ئایا خوێندنی مۆسیقا لەم وڵاتەی ئێمە تاچەند لەکارەکانی مۆسیقا پشت بەم ئامێرە دەبەستن ؟ ئایا هونەرمەند و مۆسیقا ژەنان بەهۆیی ئەم ئامێرە وە هیچ کارئاسانیەکیان لەکارەکانیان بۆکراوە ؟ ئایا قوتابیان ئاشنان بەکاری مۆسیقا بەهۆیی ئامێری کۆمپیوتەرەوە ؟ بۆ ئاشنابوون ڕویی پرسیارمان ئاراستەی چەند بەڕێزێک کرد .

ڕیپۆرتاژ و فۆتۆ:
ڕێناز ئەردەلان بەکر



**سەرەتا بەڕێز مامۆستا بەکر خالید بەرپرسی بەشی مۆسیقا لەپەیمانگایی هونەرە جوانەکانی هەولێر بەم شێوەیە هاتە دوان :**

بێگومان کۆمپیوتەر کاریگەری زۆری هەیە لەسەر هەموو زانستەکان ئێمەش وەکو بەشی مۆسیقا سودێکی زۆرمان وەرگرتوە لەپرۆگرامەکانی کۆمپیوتەر بەتایبەتی پرۆگرامی نوسینەوەی (نۆتە) چەند پرۆگرامێک هەیە کە ئێمە وەک مامۆستاو قوتابیانی بەشی مۆسیقا دەتوانین سودی لێ وەرگرین وەک پرۆگرامی (فینال) فینالی فێرجنەکانی (٢٠٠٠ تاوەکو ٢٠٠٥) نوێترین فێرجنمان لەبەردەستدا هەیە کەنۆتەی مۆسیقایی پێ دەنوسینەوە،پێشتر کەنۆتەمان بەدەست دەنوسیەوە کاتێکی زۆری دەویست،کاتێک کەدەمان نوسی دەبوایە کەسێک هەبایە بیژەنیایە ئەو کات تاوەکو بزانین ڕاستە یاخود نا .بەڵام بەهۆیی بەکارهێنانی ئەم پرۆگرامە بەهۆیی کۆمپیوتەر زۆرشتەکان ئاسان تر بوە هەم چاپی نۆتەمان بۆدەکات کەجاران لەکوردستان زۆر کەم بوو لەیەک کاتدا دەتوانین گوێ لەهەموو دەنگەکان بگریتەوە سەبارەت بەخوێندنی وانەی کۆمپیوتەر لەپەیمانگایی هونەرەجوانەکان لەقۆناغی (چوارەم و پێنجەم) دەخوێنرێ بەڵام خوێندنەکە بەرنامەی (- WINDOWS WORD) دەخوێنرێ کەدەتوانین تەنیا قوتابی ئاشنا بکەین بە چۆنیەتی بەکار هێنانی کۆمپیوتەر لە سەرەتاوە .ئەوانی تر پرۆگرامی هونەری بۆهونەرەکانی (شێوەکاری – مۆسیقا –شانۆ ) ئەوانە



دەکەوێتە سەر خودی قوتابی خۆیی کەچۆن بەکاری دەهێنێ .ئێمە هیوا خوازین وەداواکارین لەوەزارەتی پەروەردە لەم باڵە خانە نوێیە کەبۆمان دروست دەکرێ هۆڵێکی تایبەت بە کۆمپیوتەر و ئەنتەرنێت دابین بکرێ بۆ ئەوەی هەم قوتابیان و هەم مامۆستایان سودی لێ وەرگرن،چونکە کۆمپیوتەر و ئەنتەرنێت کاریگەریەکی زۆری هەیە بۆخوێندنی بابەتەکانی میوزیک و وەبەستنەوەی پەیمانگایی هونەرە جوانەکان لەڕوی کارو چالاکیەکانی بە پەیمانگاو زانکۆ کانی مۆسیقی جیهان .

**بەڕێز مامۆستا هەڵبەست صەلاح مامۆستای بەشی مۆسیقایی پەیمانگایی هونەرەجوانەکانی هەولێر بەم شێوەیە بۆچونی خۆیی دەربڕی :**



لەم سەردەمەی ئێستا کەتێدا دەژین لەگەڵ ئەو پێشکەوتنەی بواری تەکنەلۆژیا بەخۆیەوە بینیوە لەسەرجەم بوارەکاندا کۆمپیوتەریش یەکێکە لەو ئامرازو ئامێرانەی کەڕۆڵێکی کاریگەر دەبینێ بۆئاسانکاری لە گشت بوارەکانی پەروەردەو فێرکردن لەلایەنی هونەری و هەموو بوارەکانی تر. ئێمەش وەک بەشی مۆسیقا دەربارەی ئەو

پرۆگرامانەی کەتایبەتن بە بواری مۆسیقا کەزۆر سودمەندن دەتوانین سودی لێ وەرگرین کەبەئاسانترین شێوە دەتوانین( نۆتە) بنوسینەوە .پێموایە ئێمە لەپەیمانگاکەمان لەبەر نەبونی جێگایی شیاو بۆ دابین کردنی هۆڵێک تایبەت بەکۆمپیوتەر و ئەنتەرنێت زۆر سودمان لێ وەرنەگرتوە هیوادارین بۆمان دابین بکرێ وە لەداهاتودا ببێتە وانەیەک لەوانەکانی بەشی مۆسیقا بخوێنرێت وەقوتابیان لەڕوی هونەریەوە سودی لێ وەرگرن .

**بەڕێز مامۆستا هەرێم جەمال ڕەشید مامۆستای بەشی مۆسیقا لە پەیمانگایی هونەرە جوانەکانی هەولێر بەم جۆرە ئاماژەی بەوتەکانی کرد :**



لەسەردەمی ئەمڕۆدا دەتوانین بڵێن تارادەیەک سودێکی زۆرمان لە کۆمپیوتەر وەرگرتوە بەتایبەتی لەبواری مۆسیقا ئەگەر بێت و تەماشایی سالانی پێشو بکەین،ئێمە خۆمان بەنمونە بهێنینەوە کارەکانمان زۆر زەحمەت بوو بەتایبەتی لەبواری نوسینەوەی (نۆتە) ماندو بوونێکی

زۆری دەویست .بەڵام ئێستا بەهۆی ئامێری کۆمپیوتەر دەتوانین کارەکان زۆر بەئاسانی ئەنجام بدەین بەتایبەتی لەبارەی دابەش کردن و گەشەپێدنی مۆسیقا،هەروەها ئەنتەرنێتیش ئەگەر لەمەودوا بۆمان دابین بکرێ سودی زیاتری لێ دەبینرێ بۆ زانینی شێوازی خوێندن و چۆنیەتی کارکردن لەسەر مۆسیقا لەدەرەوە .

**بەڕێز مامۆستا ئاری قادر مامۆستای مۆسیقا لە پەیمانگای هونەرەجوانەکانی هەولێر گوتی:**



تارادەیەکی زۆر کۆمپیوتەر توانیویەتی ئاسانکاری لە کارەکانمان دا بکات چونکە شتەکانمان زۆربەی دەست نوس بوو بەزەحمەت پێداویستیەکان بۆمان کۆدەکرایەوە .هەروەها لەڕوی ئەنتەرنێتەوە زۆر سودمان لێ وەرگرتوە بەتایبەتی ئەو سایتانەی تایبەتە بەمۆسیقاو نۆتەوە،ئێمە پێشتر ئەوپێداویستیانەمان نەبوو ئەم نۆتانەی لای ئێمە هەبوو مامۆستاکان بەهۆیی کۆمەکی خۆیانەوە دەستیان کەوتبوو کە ئەمیش ئی ساڵەکانی ( شەست و پەنجاکان) بوو بەڵام ئێستا بەهۆیی ئەنتەرنێتەوە دەتوانین زۆربەی پارچە مۆسیقا نوێ خوازەکان وەربگرین بو

ئەوەی لای خۆمان ڕاست و دروست وەربیگرین کاری پێ بکرێ،وەچۆن قوتابیان لێرە ئامێری مۆسیقای تایبەت بەخۆیان هەیە بەو ئاستە پێویستیمان بە کۆمپیوتەر هەیە لەم بەشە،چونکە ئێستا وای لێهاتوە کارەکان دوادەکەوێ زەحمەت دەبێ ئەگەر قوتابی خۆی لەکۆمپیوتەرو ئەنتەرنێت شارەزا نەبێت چونکە یاریدەدەرێکی زۆر باشە ڕێ نیشاندەرێکی باشە ئەو بەرنامانەی کە هەیە و تایبەتە بەمۆسیقا .

**هەروەها هونەرمەند هەردی صەلاح بە مەبەستی چۆنیەتی بەکارهێنانی ئامێری کۆمپیوتەر لەهونەری مۆسیقادا دەڵێت:**



هەڵبەتە ئەو کارە مۆسیقیانەی کەلەکوردستان کەپێش چەند ساڵێک لەمەوبەر ئێمەی هونەرمەندان دمان کرد لەڕێگای دەست نوسەوە بوو دوای ماندووبون و هیلاکیەکی زۆر دەهاتە بەردەستی مۆسیقا ژەنان و هونەرمەندان،بەلام لەم گۆڕانکاریەی کەبەسەر عێراق و کوردستان هات بەتایبەتی پاش ئەوەی کۆمپیوتەر بووە یەکێک لەبەرنامجە هەرەسەرەکیەکانی ژیان بەگشتی لەبواری هونەریش بەتایبەتی،من بۆخۆم لەدوایین کارمدا زۆر تیشکم خستە سەر بەکارهێنانی کۆمپیوتەر بۆکەم کردنەوەی هیلاکی وماندوبون بۆ بەڕێوەچونی کارەکان بەشێوەیەکی ڕێک و پێک لەهەمان کاتدا ئەنتەرنێتیش زۆرسودی هەیە بۆنمونە من خۆم توانیومە لەڕێگای ئەنتەرنێت مێژوی مۆسیقا بخوێنمەوە، یاخود لەهەندێک شێوەو شێوازو ستایلی مۆسیقا لەدەرەوە شارەزابم و ئاگاداربم. .

**بەڕێز مامۆستا نایف شێخانی مامۆستای مۆسیقا لە پەیمانگای هونەرەجوانەکان گوتی :**



سەبارەت بەم ئەزموونەی کارکردنە ئەزمونێکی تازەیە لە بەکارهێنانی ئەوپرۆگرامانەی تایبەتن بۆ نوسینەوەی (نۆتە)ی مۆسیقا یاخود ئەندازیاری دەنگ کەساڵانێکە لەکوردستان کاری لەسەر دەکرێ زۆرئاسانکاری کردوە لەڕوی تۆمار کردنی دەنگ .ئێمەلێرە کەسانی شارەزامان هەیە بەلام ئەزمونەکەی سەرەتاییە و مامۆستایەکی پسپۆڕو شارەزا نەبوە لەم بوارە بۆیە هەرکەسێک شارەزایی هەیە لەم بوارە، یاخود هەرناوەندێکی ڕۆشنبیری و ڕاگەیاندن یاخود ناوەندێکی ئەهلی کە گرنگی بەو بابەتە دەدەن زیاتر باپەرە بەم بوارە بدەن بۆ گەنج و ئەو خەڵکانەی کەئارەزوومەندن لەکاری هونەری مۆسیقا، من ڕوی دەنگی خۆم دەخەمە پاڵ ئەو مامۆستایانەی کە لە پرۆگرامە مۆسیقاییەکان شارەزان ئەگەر بکرێ لەڕێگای (گۆڤاری کۆمپیوتەر) ەوە بەزنجیرە پرۆگرامەکان دابیەزێنن بڵاوی بکەنەوە وەری بگێڕنە سەر زمانی کوردی بۆ ئەوەی بتوانین سودی لێ وەرگرین .

**بەڕێز شێرزاد محەمەد حسێن بەڕێوەبەری کۆشکی هونەر بەم شێوەیە تیشکی خستە سەر وتەکانی:**



لەو سەردەمەی پێشکەوتنە کە سەردەمی ئامێرەو ڕۆژ بەڕۆژ لەگەشەسەندن دایە، وەمرۆڤ پشت بەم ئامێرانە دەبەستێ هەموو لایەک بەکاری دەهێنن .بواری مۆسیقاو گۆرانیش بێ بەش نیە لەم بەژداریە فراوانەی کەئێستا هەموو دنیا ڕوویی تێ کردوە .بەلام بەبۆچونی من چەندی ئامێری تەقەنیات تێکەڵ بەشتە ڕۆحیەکان بێ،مەسەلەی ڕۆحی تێدا بزردەبێ بەتایبەتی لەگۆرانی و مۆسیقا .من واهەست دەکەم کارەکان تابلێی خاوێنە نەشازی مۆسیقای دەتوانی پێ چاک بکەی بەهۆیی ئامێری کۆمپیوتەرەوە دەتوانی سەرجەم کارەکان کۆنترۆڵ بکەی بەلام مەسەلەی ڕۆحیەتی مۆسیقای تێدا بزر دەبێ .بەلام لەگەڵ ئەوەش ناکرێ ئەم لایەنە فەرامۆش بکەی لەگەڵ ڕەوتی نوێ و ڕەوتی مۆسیقای جیهانی ئێستا دنیایی کومپیوتەرو ئەنتەرنێتە کە هەموو هونەرمەندان کاری پێ دەکەن.



# وێب سایتێک بۆ فرۆشتنی مندالان

**خەتاب رەسول حەمەد**

دەزگاکانی راگەیاندنی چینی رایانگەیاند کە چەند پرو پاگەندەیەک لەسەر تۆری ئینتەرنێت کە لە کۆمپانیای (ئای بای) بلاوکراونەتەوە و تێیدا چەند مندالێک نمایش دەکات بۆ فرۆشتنیان، لەم بارەیەوە رۆژنامەی (چاینا دەیلی) رایگەیاند کە وێب سایتی کۆمپانیای ناوبراو بە لێنی داوە کە مندالی تەمەن کەمتر لە (١٠٠) رۆژ دابین بکات بۆ ئەو کەسانەی دەیانەوێ و گشت مندالەکان لە هەرێمی هینانی هەژارنشینە، رۆژنامەکە هەروەها دەلێ نرخی مندالەکانیش جیاوازە بە گوێرەی رەگەزیان (٢٨٠٠٠) یوانی چینی نرخی کورانە و (١٣٠٠)یوانیش نرخی کچانە و زیاتر لە پەنجا پروپاگەندەیان خوێندووتەوە، بەلام تا ئێستا هیچ کارێکی کرین و فرۆشتن ئەنجام نەدراوە رۆژنامەکە هەروەها ئەوەشی راگەیاند کە ئەو کەسەی پرو پاگەندەکەی بلاو کردۆتەوە خۆی بە داهێنەر دادەنێت بۆ یارمەتی دانی سەدان خێزانی چینی کە توانای مندال بوونیان نییە، بەلام رۆژنامەکە ئەوەشی روون کردەوە کە دوور نییە بلاوکردنەوەی ئەم پروپاگەندەیە بۆ گالتە پێکردن بێت .لەبەر یاسای دیاری کردنی مندال، کرین و فرۆشتنی مندالان لە وولاتی چین گرفتێکی گەورەیە بۆ دەزگاکانی دەولەت و هەمیشە مایەی قسەو باسی خەلکی یە بۆیە ئێستا پۆلیسی چینی لە هەولێکی بەردەوامدایە بۆ دۆزینەوەو ئاشکرا کردنی ئەو کەسەی کە ئەو پرو پاگەندەیەی بلاوکردۆتەوە و ئەگەر دەستگیر بکرێت ئەوا سالانێکی زۆر لە زیندان بەسەر دەبات یان یەکسەر لە سێدارە دەدرێت.

# بەهۆی Skype وە لەئەنتەرنێت پەیوەندی تەلەفۆنی ئەنجام بدە

ئا: کاردۆ شەیدا




وێنەی (١)

دەتوانیت لەئەنتەرنێتەوە پەیوەندی تەلەفۆنی بۆ هەموو جیهان بکەی ئەم بەرنامەیە وەک بەرنامەی MSN و YAHOO کار دەکاتن بەلام بەشێوەی تەلەفونی دەبێ بەژداری بکەین لەبەرنامەکە پاشان دەتوانین کاری پێبکەین




وێنەی (٢)

لەسەرتاوە دەچینە سەر بەرنامەکەو دەیکەینەوە هەڵدەستین بە بەژداری کرن.

بۆئارەزوی خۆمان ناوێک دەنوسین، پاشان ژمارەی بەژداربوو و دیسان ژمارەی بەژداربوو لەپاشان NEXT دەکەین (وێنەی ٢).

لەپاشان بەچ ناوێک ببینە ئەندام وە ناوی وڵات وناوی شار لەپاشان نوسینی ئیمێلی خۆت ئینجا NEXT دەکەین (وێنەی٣)

لەپاشان کەدەبینە ئەندام لەبەرنامەکەدا بەخۆی چەند ناوێکمان دەداتێ بەناوی خومان و ژمارەی تایبەتی لەگەڵ دایە هەرکامەکمان بوێ هەڵی دەبژێرین (وینە ٤).

ئنجا ئەو کەسەی کەدەمانەوێ تەلەفونی بۆبکەین ناوەکەی دەنوسین و هیمای



وێنەی (٣)

SEARCH کلیک دەکەین (وێنەی ٥).

پاش گەران بەدوای ناوەکە ئەگەر کەسەکە لەخەت بێ پێمان نیشان دەدات لەدواییدا لەسەر ناوی ئەو کەسەوە کلیکی لای راست دەکەین هێمای تەلەفۆنەکە کلیک دەکەین (وێنەی ٦).

لەپاشان تەلەفۆنەکە زەنگ لێ دەدات کەسەکە هەڵی دەگرێ ئینجا قسەی لەگەڵدا بکە (وێنەی ٧)

تێبینی :

دەبێ ئەوکەسەی کەتەلەفۆنەکەی بۆدەکەین دەبێ ئەندامێک بێت لەم بەرنامە ئینجا دەتوانین تەلەفۆنی بۆ بکەین.



وێنەی (٤)



وێنەی (٥)



وێنەی (٦)



وێنەی (٧)

# کورتکراوەی ووشەکان لە چاتدا

ئا: کەمال عبداللە

بەڕێزان هەموومان کەم یا زۆر چەندین کاتژمێر لە بەرامبەر کۆمپیوتەر دادەنیشین و خەریکی چات کردن دەبین، لە میانەی چات کردندا هەندی جار هەندی پەیام و ووشەی سەیر دێتە سەر پەنجەرەی چات کە زۆر کەم لێی تێدەگەین یان هەر هیچ تێناگەین، بۆیە لێرەدا هەوڵم داوە ئەو ووشانەی لە چاتدا کورتکراونەتەوە ڕوون بکەمەوە بەو هیوایەی جێی ڕەزامەندی خوێنەرانی بەڕێز بێت.

| کورتکراوە لە چاتدا | ووشە یان ڕستەی بنەڕەتی | واتای بەکوردی |
|---|---|---|
| HT | Hi There | سڵاو |
| HRU | How Are You? | چۆنی ؟ |
| ASL | Age/Sex/Location | تەمەن/ ڕەگەز/ شوێن |
| poof | has left the chat | چاتی بە جێ هێشتووە |
| AFAIK | Az Far As I Know | ئەوەندەی کە من دەزانم |
| ASAP | As Soon As Possible | بەم زووانە |
| OMG | Oh My God | ئاە خوایەکەم |
| BF | Boy Friend | بەرادەری کوڕ |
| Gf | Girl Friend | بەرادەری کچ |
| BTW | By The Way | بەڕاستی |
| OTOH | On The Other Hand | لە لایەکی ترەوە |
| EMSG | Email Message | پەیامی ئەلیکترۆنی |
| F2F | Face to Face | ڕوو بە ڕوو |
| TY | Tank You | سوپاس |
| IAE | In Any Event | هەر چونێك بێت |
| OIC | Oh I See | کەواتە تێگەیشتم |
| IC | I See | تێگەیشتم |
| IMO | In My Oponion | بە ڕای من |
| IMS | I`m Sorry | بەداخەوە |
| LYF | Love You Foreve | بۆ هەموو کات خۆشم دەوێی |
| LY | Love Ya | خۆشم دەوێی |
| ILY | I Love You | خۆشم دەوێی |
| FYI | For Your Information | بۆ ئاگاداریت |
| IOW | In Othere Word | بە واتایەکی تر |
| JK | Just Kidding | گاڵتە دەکەم (شۆخی دەکەم |
| EG | Evil Grin | پێکەنینی شەیتانی |
| BEG | Big Evil Grin | پێکەنینی توندی شەیتانی |
| L | Laugh | پێکەنین |

| کورتکراوە لە چاتدا | ووشە یان ڕستەی بنەڕەتی | واتای بەکوردی |
|---|---|---|
| LOL | Laugh Out Loud | پێکەنین بە دەنگی بەرزەوە |
| S | Smile | پێکەنین |
| ROFL | Rolling on Floor Laughing | لە پێکەنینیا لە سەر زەوی درێژ بوون |
| ROTFL | Rolls on The Floor Laughing | لە پێکەنینیا لە سەر زەوی درێژ بوون |
| PM | Private Message | پەیامی تا یبەت |
| TNX | Thanks | سوپاس . |
| L8R | Later | دوایی |
| FC | Fingers Crossed | پاڕانەوە (دوعا کردن ) |
| WBS | Write Back Soon | زوو وەڵامی نامەکە بدەوە |
| DWB | Don't Write Back | وەڵامی نامەکە مەدەوە |
| LTNS | Long Time No See | ئاگابوون بۆ ماوەیەکی زۆر |
| BRB | Be Right Back | ئێستا دەگەڕێمەوە |
| BBS | Be Back Soon | زوو دەگەڕێمەوە |
| BBL | Be Back Later | دوایی دەگەڕێمەوە |
| TTYL | Talk To You Later | دوایی پێت دەڵێم |
| TOY | Thinking Of You | تۆم لە بیرە |
| TNT | Till Next Time | تا جارێکی تر |
| SYL8TR | See You Later | دوایی دەت بینم |
| SYS | See You Soon | بەم زووانە دەتبینم |
| CU | See You | دەتبینم |
| GFN | Gone For Now | جارێ دەڕۆم |
| GTSY | Glad To See You | لە بینینت خۆشحاڵ بووم |
| Nice 2 C U | Nice To See You | لە بینینت خۆشحاڵ بووم |
| AFK | Away From Keyboard | دوور لە کیبۆورد |
| GL | Good Luck | سەرکەوتوو بی |
| TTFN | Ta Ta For Now | جارێ خوا حا فیز |
| BBN | Bye Bye Now | خوا حا فیز |
| BFN | Bye For Now | خوا حا فیز |

# چەند ڕێنمایەکی گرنگ بۆ ئەو کەسانەی ئیمەیڵی خۆیان لە قاوەخانەکان دەکەنەوە




ئاشنا فواد

لەگەڵ ئەوەی کە کوردستانیش پێشکەوتنی بە خۆوە بینیوەو توانیویەتی هەنگاوی باش لە بوارەکانی کۆمپیوتەرو ئەنتەرنێت ببڕێت، لەگەڵ ئەوەش کە ئێستا بە چەندەها سیستەمی جۆراو جۆر خزمەت گوزاری ئەنتەرنێت دەگوازرێتەوە بۆ ناو ماڵان و، خەڵک لەناو ماڵی خۆی سەردانی هەموو دونیا دەکات و دەگەڕێتەوە، بەڵام لەگەڵ ئەم هەموو پێشکەوتنەش هێشتا لە کوردستان و لە هەموو وڵاتانی دونیا قاوەخانەکانی ئەنتەرنێت سەنگ و کاری خۆیان ماوە ئەمەش لەبەر زۆرهۆکار کە یەکێک لەوانە سەردانی کردنی میوانە بۆ شارەکە یان پچڕانی هێڵە لەماڵەوە یان نەبونی هێڵە لەماڵەوە ناچار دەبێت سەردانی قاوەخانەکان و سەنتەرەکانی ئەنتەرنێت بکەیت، جا یەکێک لە خزمەتگوزاریەکانی ئەنتەرنێت بریتیە لە پۆستی ئەلیکترۆنی کە بە خزمەتگوزاریەکی تایبەت و کەسی دەناسرێت چونکە هەڵگری ناسنامەیەکی تایبەت و خاوەن وشەی تێپەڕ بوی تایبەت

بـە خۆتی بۆیـە لەهەمان کاتـدا ئیمەیڵی کۆمپانیاکانیش پڕە لە ژمارەی حسـابات و چەنـدان پەیوەسـتنامەی بازرگانـی . جـا لێـرەدا زۆربـەی ئـەو ئیمەیڵانەی کـە دەدزرێـن لەڕێـگای سـەنتەرەکانی قاوەخانەکانـەوە دەبێـت بۆیە بۆ ئەوەی لەم مەترسـیە ڕزگاری بێت ئەم خاڵانەی خوارەوە پەیڕەو بکە لە هەرکاتێک کە لە سەنتەرەکان و قاوەخانەکانی ئەنتەرنێت ئیمەیلەکـەی خـۆت کـردەوە، چونکـە زۆربـەی هـەرە زۆری قاوەخانـەکان بەرنامـەی تەجەسـوس و هاکەریـان تێدایە.

١- به هیچ شـێوەیەک پاسـۆردی خـۆت لـە نـاو ویندۆزەکـەدا خـەزن نەکەیت.

٢- کـرداری (SIGN OUT) یـان (LOG OUT) بکە ئینجا سایتەکە دابخە.

٣- سـڕینەوەی تەواوی فایلەکانی ناو هیستۆری و ناو (TEMP) .

٤- بچۆرە ناو کۆنترۆل پەنەلەوە لەوێش بۆ سەر (INTERNET OPTIONS) لە وێش بۆ سەر (CLEAR HISTORY) کلیک لەسەر بکە تا تەواوی ئەو شـوێنانەی سەردانت کردون بسرێنەو

ه. دواتر بۆ سەر (DELETE COOKEIS) بۆ سـڕینەوەی فایلاتـی کوکیز وە دواتر بۆ سـەر (DELETE FILE) بۆ سڕینەوەی فایلاتـی کاتـی لە نـاو کۆمپیوتـەردا کە تایبەتن بەو کارانەی کە تۆ ئەنجامت داون دواتر دەچینە سەر بەشی (CONTENT) لە وێـش (AUTOCOMPLETE) هەڵدەبژێرین ئینجا کلیک لەسەر (CLERE PASSWORD) دەکەیـن بـۆ سـڕینەوەی پاسـوۆرد و کلیـک لەسـەر (CLERE FORM) بکـە بۆ سرینەوەی تەواوی فایلەکان دواتر کلیک لەسەر (OK) دەکەین.

٥-چونـە دەرەوەیەکـی تـەواو لە ناو ماسـێنجەر یـان لـە هـەر بەرنامەیەکی چاتکردن بێت .

٦- بـۆ زیاتـر دڵنیـا بونیـش لەکاتـی گەڕانەوت بۆ ماڵەوە یان شـوێنی گشتی خۆت یەکسەر پاسوۆردەکەت بگۆرە.

# کۆمەڵێک سایت و لینک بۆ ئاوازی مۆبایل

**دەریا تحسین/سلێمانی**

www.itsalat.com
www.alltones.cjb.net
www.Ringtones.co.uk
www.monkeymobile.com
www.mobileoperatorlogos.com
www.image2000plus.com
www.dwightbrown.com
www.pod.com.sg
www.mcdsonline.com
www.kyasuno.com
www.ring-tones.de
www.my-nokia.co.uk
www.ringtonezone.co.uk
www.el6abel.8m.net
www.guardian.co.uk
www.tonesandstuff.com
www.talkintones.co.uk
www.phoneringtones.net
www.nokiaheaven.co.uk
www.freecomms.co.uk
www.fritzenkoetter.de
www.newringtone.co.uk
www.mobileextra.com
www.monkeymobile.com
www.myringtones.net
www.mobileringtonez.com
www.mobileringtones.com

www.tones4fones.com
www.yourmobile.com
www.mobilefun.co.uk
www.mobile4arab.com
www.foxy.fr.fm
www.absolute-ringtones.co.uk
www.wap.lebrun.org.uk
www.goodringtones.com
www.1a-nokia-ringtones.com
www.fonekables.co.uk
www.customcarcolours.co.uk
www.click-thru.ws
www.abort-retry-fail.co.uk
www.linux.ie
www.tightkit.com
www.absolute-ringtones.co.uk
www.earth-tones.com
www.richtones.org
www.taggytones.dk
www.tonesofhome.freeservers.com
www.tikitones.com
www.civiltones.com
www.vitoandthev-tones.com
www.arabic-tones.com
www.uk-ring-tones.co.uk
www.nokia-klingeltoene.handy-coool.de



# چۆن منالەکانمان دەپارێزین لە سایتی نادروست و زیان بەخش

نەمام عمر

ئاشکرایە کە تۆڕی ئەنتەرنێت لەگەڵ ئەوەی کە زۆرترین خزمەت گوزاری و زانیاری پێشکەش بە میوانەکانی دەکات لە سەرتانسەری جیهاندا بەبێ جیاوازی بەهەمان شێوەش شاڵاوی زیان و مەترسیەکانی زیانەکانی هەموو دونیای تەنیوە بەپێی زۆربەی ئامارەکان لایەنەکانی بواری کۆمپیوتەرو ئەنتەرنێت کردویانە زۆربەی ئەوانەی کە زیانیان پێدەگات منال و هەرزەکارانن ئەمەش کێشەیەکی گەورەی ناوەتەوە بۆ ئەو دایک و باوکانەی کە منالەکانیان ئەخەنە بەردەم شاشەکانی کۆمپیوتەرو تۆری ئەنتەرنێت . تا گەیشتە ئەو ڕادەی چەندان کورو کۆبونەوەی گرنگی کۆمپیوتەرناسان و زانایانی بواری کۆمپیوتەر بەشداری بکەن بۆ دۆزینەوەی شیاوترین ڕێگە بۆ بەکارهێنانی ئەنتەرنێت لە لایەن منالان و ڕێگەدانیان بۆ چونە سەر ئەنتەرنێت .

جا بۆ ئەوەی منالانی کوردیش بەهەمان شێوە توشی ئەم زیان و گرفتە نەبن پێویستە لەسەر هەموو دایک و باوکێک کە ڕێنمایی منالەکانیان بکەن و بە هێمنی چاودێریان بکەن و ئەو سایتانەیان نیشانی منالەکان بدەن کە زۆرترین سودی لێوەردەگرن . بۆ ئەم مەبەستەش پێویستە کە :

یەکەم شت کە پەیرەو بکرێت و ئاسانترین ڕێگەچارەشە بۆ ئەوەی منالەکان بپارێزێت بریتیە لە دانانی کۆمپیوتەرەکە بەشێوەیەک کە شاشەکەی لە دایک و باوک دیاربێت کاتێک منالەکە کار لە ئەنتەرنێت دەکات، بەشێوەیەک بەبێ ئەوەی ئەو منالە هەست بەوە بکات کە چاودێری دەکرێت چونکە ئەگەر وا هەست بکات ڕەنگە پەستانێکی دەروونی لەسەر دروست بێت . دووەم بەردەوام منالەکان بەوە هانبدەن کە بچێتە ناو سایتی نوێو بەسود وە بۆ ئەم مەبەستە باوک یان دایک هاوکاری بێت لە گەڕانی زانیاریدا . لەگەڵ ئەمەشدا ئەتوانرێت بەرنامەی تایبەت دامەزرێنیت لە ناو کۆمپیوتەر کە ڕێگا لە وێنەو سایتی زیانبەخش و نادروست بۆ منالەکان دەگرێت وەکو بەرنامەی (WEBLOCKER) کە لە ژمارەکانی داهاتوو بەدرێژی باسی دەکەین.

# چۆن خێرایی ئەنتەرنێتەکەت دەزانیت



وێنەی (١)

ئا: ڕێژنە غەفور

زۆر گرنگـە زانیاریت لەسـەر خێرایی ئەنتەرنێتەکە هەبێت کە بەکاری دەهێنیت و بەنیازی کردنەوەی سایت یان داونلۆد کردنـی بابەتێـک یـان بەرنامەیەک بێت، چونکـە خێرایـی کارکـردن پەیوەنـدی بـە مانـەوەو سـود وەرگرتـن هەیە لە ئەنتەرنێـت بۆ ئـەم مەبەسـتە دەتوانیت لـە ڕێگای ئـەم لینکـەوە خێرایـی و زانیـاری لەسـەر ئەنتەرنێـت وەرگریت HTTP://US.MCAFEE.COM/ROOT/) (SPEEDOMETER/DEFAULT.ASP ئەویش بەم هەنگاوانەی خوارەوە . دوای کردنەوەی ئەم سـایتەی سەرەوە، دوای کرانـەوەی کلیـک لەسـەر (NOW TEST) دەکەیـن بڕوانە وێنـەی (١) کە ڕوکاری سـایتەکە نیشـان دەدات . دواتر ئاستی خێرایی و ڕاپۆرتێک لەسـەر هێلەکەت بە پوختەیی دەداتی بڕوانە وێنەی (٢) .



وێنەی (٢)




# پەیوەندی تەلەفۆنی لەڕێگای ئەنتەرنێت

ئا:دیار عزیز

کۆمپانیای یونایتد ئۆنلاین کەلەبواریخزمەتگوزاری ئینتەرنێت کاردەکات لەم دواییەداخزمەتگوزار یەکی نوێی بۆ پەیوەندی تەلەفۆنی لەڕێگای پرۆتۆکۆلی ئینتەرنێت دەستە بەرکرد بەناوی(نیت زیرو)، بەپێی ئەم خزمەتگوزاریە کۆمپانیاکە لەرێکای پرۆتۆکۆلی (ڤی ئۆ ئای پی) پەیوەندی تەلەفۆنی لەنێوان کۆمپیوتەرەکان دەبەستێت بەبێ هیچ باجێک بەجۆرێک تۆری ئینتەرنێت وەکو تۆڕێکی تەلەفۆنی بەکاردێت کەبەکارهێنەران دەتوانن بەهۆیەوە هێلی ئەنتەرنێت بۆپەیوەندی تەلەفۆنی بەکاربهێنن، وەهەروەها کۆمپانیاکە حاڵی حازر پەیوەندی لەنێوان کۆمپیوتەر بۆ کۆمپیوتەر بەخۆڕایی دەستەبەر دەکات بەڵام پەیوەندی لەنێوان کۆمپیوتەر بۆ ئامێری تەلەفۆن تا (٣) مانگی تر بەخۆڕایی دەبێت و دوای ئەم بەرواره لەسەر بەکارهێنەران پێویستە مانگانە بڕی (١٥) دۆلار بدەن بەکۆمپانیاکە، وەهەروەها بەهۆی ئەم خزمەتگوزارییە دەتوانرێ پەیوەندی بکرێ بە ئەمەریکا و کەنەدا و بۆرتۆریکۆ بەخۆڕایی بەڵام بۆ وولاتانی تری جیهان (٢)سەنت دەبێت بۆ (١) دەقیقە.

وەپێشبینی دەکرێت قەبارەی بازاری پەیوەندی لەڕێگای پرۆتۆکۆلی ئەنتەرنێت لەساڵی ٢٠٠٩ ز بگاتە ٢٣,٤ ملیار دۆلار بەبەراورد لەگەڵ ساڵی ڕابردوو کە ١,٢ ملیار بوو، بەهەمان شێوە چاوەڕوانکراو دەکرێت ژمارەی بەکارهێنەرانی ئەم خزمەتگوزارییە تاساڵی (٢٠٠٩)ز (٣\١١)ی دانیشتوانی ئەمەریکا و ئەوروپا بگرێتەوە و لە (٧٠٪) ی پەیوەندییە تەقلیدییەکان بگۆڕێت بۆ پەیوەندی لەڕێگای ئەنتەرنێت بێگومان ئەمەش بەهۆی کەمی تێچوونی پەیوەندییەکان دەبێت.

سەرچاوە : البوابة العربية

# بە هاوکاری (گۆگل) و (ئەمازۆن) کتێبخانەیەک لەسەر تۆری ئینتەرنێت بڵاودەکرێتەوە

کاروان سعید عمر




پاش رکابەریەکی توند لە مەیدانی بڵاوکردنەوەی ئەلیکترۆنی، هەردوو کومپانیای (گوگل) و (ئەمازۆن). هاوکاری یەکتر دەکەن بو بەرهەم هینانی تۆریکی ئەلیکترۆنی کە ریگە بە بەکارهێنەرەکانی دەدات بەکرینی لاپەرەو بەشی ئەو کتێبانەی کە دەیانەویت، راستەوخۆ لە ریگەی ئینتەرنیتەوە.

وا چاوەروان دەکریت ئەو بەرنامەیە هەموو ئەو سیستەمانە کۆبکاتەوەکە ئیستا بوونیان هەیە و خزمەت گوزاری گەران بە دوای کتیب پیشکەش دەکەن لە ریگەی ئینتەرنیتەوە.

گوگل و ئەمازۆن ئەم بیرۆکەیان لە کومپانیای (ئەپل)ی بواری مۆسیقا و گورانیەوە وەرگرتووە و بە شیوەیەکی پراکتیکی لەسەر جیهانی کتیب و بلاوکراوەکان پەیرەوی دەکەن، وە لە ریگەی ئەو بەرنامەیەوە بەکارهینەرەکانی دەتوانن هەر کتیبیکیان مەبەست بیت بیکرن.

پیشنیازی دروست کردنی ئەو جۆرە بەرنامەیە جۆرە رینەکەوتنەکی دروست کرد لە نیوان خانەی بلاوکردنەوەی کتیب و ئەو کومپانیایەی کە خزمەتی گەران بە دوای کتیبدا پیشکەش دەکات،بۆ دابەش کردنی ئەو قازانجەی لەو پرۆژەیەوە دەکریت.

بەلام خانەی (راندۆم هاوس)کە گەورەترین خانەی بلاوکردنەوەی کتیبە،پیشنیازی ئەوەی کردووە کە بۆ هەر لاپەرەیەکی کتیبیک نرخی (٥) پینج سەنت وەربگیریت و بە یەکسانی دابەشی سەر خانەی بلاوکردنەوە و نووسەری کتێبەکە بکریت.

گۆگل ئەم پرۆژەیە وەکو مەبەستیکی دانوستاندن بەکاردەهینیت لەگەل ئەو کۆمپانیایانەی کە داوای یاسایان دژی گوگل تۆمارکردووە، و تاوانبارییان کردووە بە پیشیل کردنی مافی بلاوکردنەوەی ئەو کتیبانەی لە ریگەی ئەو کۆمپانیایانەوە بلاوکراوەتەوە و گۆگلیش ئەو کتیبانەی وەکو مادەیەک بەکار هیناوە لە سایتەکەی خۆی.

لەلایەن خۆیەوە کۆمپانیای ئەمازۆن دوو بەرنامەی تریشی ئامادە کردووە تا لە سالی داهاتوو بلاویان بکاتەوە،کە یەکیکیان بە ناوی (AMAZON PAGES)ە کە بەکاردەهینریت بۆ گەران بە دوای ناونیشانی کتیبەکان و کرینیان لەریگەی سایتەکەوە، جیاوازی نیوان گوگل و ئەمازۆن لەو خالەوە دەردەکەویت کە ئەمازۆن پیشینەیەکی هەیە لەگەل بەکارهینەرەکانی کە بە دوای کتیبدا دەگەرین بەلام گوگل تاکە سایتە بۆ هەموو خەلک کە بە دوای هەر شتیکدا بگەریت و دەستی بکەویت.



# داهێنەری ماڵپەری Hotmail

**نبیل ع. فتاح**
nabil_af@yahoo.com

ئەم ماڵپەرە بە شێوەیەکی زۆر بەرفراوان بەکاردێت لە جیهاندا، زیاتر خزمەت گوزاری ئاڵوگۆڕکردنی نامە لە خۆی دەگرێت و یەکێکە لە ماڵپەرە تایبەتیەکانی سەر بە کۆمپانیای مایکرۆسۆفت.

لە راستیدا داهێنەری ئەم ماڵپەرە خەڵکی وولاتی هیندستانە و ناوی (صابر باتیا) یە لە ساڵی ١٩٨٨ لە زانکۆی ستانفۆرد بە پلەی نایاب (امتیاز) دەرچووە، پاش دەرچوونی لە زانکۆ لە یەکێک لە کۆمپانیاکانی ئەنتەرنێت وەک پرۆگرام ساز (بەرنامە دانەر) کاری کرد، لەم کۆمپانیایە هەڤاڵێکی هەبوو بە ناوی (جاک سمیس) کەوا هەردەم بە نهێنی دادەنیشتن و بیریان لەوە دەکردەوە کەوا کۆمپانیایەکی تایبەت بۆ خۆیان ساز بکەن، بەلام بەڕێوەبەری کۆمپانیاکە بەم کارەی زانی و ئەم جۆرە دانیشتنانەی لیان قەدەغە کرد، بەلام صابر وازی نەهێنا بۆ خۆی بە تەنها کاری بۆ ماڵپەڕێک کرد بۆ خزمەت گوزاری نامە ئاڵ و گۆڕ کردن، لە ساڵی ١٩٩٦ نهێنی ئەم کارەی ئاشکرا بوو بە تەوابوونی ماڵپەڕی جیهانی بە ناوی هۆت مەیل، ئەم ماڵپەرە زۆر بە خێرایی لە نێو خەڵک دا بڵاو بوەوە، ئەویش لەبەر ئەم تایبەت مەندیانە بوو:

یەکەم: بەبێ بەرامبەرە (بە خۆڕایی یە).

دووەم: تاکی یە (واتە بۆ یەک کەس بەکار دێت).

سێ یەم: نهێنی پارێزراوە.

چوارەم: دەتوانی لە هەموو شوێنێک بە کاربهێنی.

لە ساڵی یەکەمی بە کارهێنەرانی ئەم ماڵپەرە گەیشتە نزیکەی ١٠ ملیۆن کەس لە جیهاندا، ئەم هۆیانە سەرنجی (بیل گیتس) ی خاوەنی کۆمپانیای مایکرۆسۆفتی بۆ خۆی راکێشا بەکڕینی ئەم ماڵپەڕە، بۆیە لە پایزی ساڵی ١٩٩٧ بری ٥٠ ملیۆن دۆلاری خەملاند بۆ کرینی ئەم ماڵپەرە، بەلام صابر داواکەی بیل گیتسی رەت کردەوە و رازی نەبوو بەم برە پارەیە بیفرۆشێت، لە ساڵی ١٩٩٨ بە ٤٠٠ ملیۆن دۆلار فرۆشتی بە کۆمپانیای مایکرۆسۆفت و لە کۆمپانیای ناوبراویش دامەزرا وەک خەبیر. ئەم جۆرە کارە وای کرد صابر سامانێکی زۆر کۆبکاتەوە و ناوبانگی باشی دروست کرد بۆیە بیل کلینتۆنی سەرۆکی ئەمەریکا داوەتی کرد، پاشانیش جاک شیراک، لە دوای ئەویش سەرۆک وەزیرانی هیندستان (بیهاری فاجباتی) داوەتی کرد. ئەوە شایانی باس کردنە و جێگەی خۆشحالیە باسی بکەم دەربارەی صابر ئەوەیە کەوا چەندین پەیمانگەی لە وولاتەکەی خۆی کردەوە بەم برە پارەیە هەروەها یارمەتی قوتابیانی هەژار و کەم دەرامەتی وولاتەکەی دا بۆ تەواو کردنی خوێندنیان، باسی دەکەن و دەڵێن (سامانەکەی زۆر بە خێرای کەمی دەکرد تاوای لیهات ئێستا بە ١٠٠ ملیۆن دۆلار مەزندە دەکرێت). ئەم پیاوە جێگای رێز و شانازایە بۆ خەڵکی وولاتەکەی خۆی بۆیە جێگای خۆیەتی ئێمەش باسی بکەین چونکە وەفای هەبوو بۆ وولاتەکەی. هیوادارم نموونەی ئەو جۆرە پیاوە زۆر بێت لە وولاتی ئێمە.

# ڤایرۆسی (Playstation) یش پەیدابوو




## ئا: باوکی خەتاب

ئاژانسی ڕۆیتەرز لە هەواڵێکیدا بڵاوی کردەوە کە پسپۆرانی ئاسایشی تەکنەلۆژیای زانیارییەکان توانیویانە ڤایرۆسێکی ترسناک لە جۆری (ئەسپی تەروادە) بدۆزنەوە کە لە بنەڕەتدا زیاتر تووشی ئامێرەکانی (PLAY STATION)ی مۆبایلەکان کە کۆمپانیای سۆنی بەرهەمی دەهێنێت دەکاتە ئامانجی خۆی، لەم بارەیەوە ( ئێریک تشین ) کە ئەندازیاری پرۆگرامەکانە لە کۆمپانیای سیمنتک بۆ نەهێشتنی ڤایرۆسەکان کە بە (نۆرتۆن) ناسراوە گووتی: کۆمپانیای (نۆرتۆن) لە ڕێگای چاودێری کردنی یەکێک لە ژوورەکانی چاتی ئەلیکترۆنی تایبەت بە یارییەکانی ڤیدیۆ بۆ یەکەم جار ڤایرۆسەکەی دۆزییەوە ئەمەش یەکەم جارە ڤایرۆسێکی تایبەت بە یارییەکانی ڤیدیۆ بدۆزرێتەوە، (تشین) ئاماژەی بەوە کرد کە ئەم ڤایرۆسە زیاتر هەرەشە لەو ئامێرانە دەکات کە خاوەنەکانیان دەیانەوێ بەرنامەی تایبەتی لەسەر ئەنجام بدەن، هەروەها لە ڕێگەی ئەنتەرنێتیشەوە ڤایرۆسەکە بڵاودەبێتەوە بە ناوی:(EXPLOIT 2G PSP TEAM V1. RAR ) (تشین) ئەوەشی دووپات کردەوە کە تێکدەرانی کۆمپیوتەر چوار چێوەی کارەکانیان فراوان کردووە و ئێستا لە تێکدانی کۆمپیوتەری ئاسایی دەرچوون و ڕوویان لە تێکدانی مۆبایل و یارییەکانی ڤیدیۆش کردووە .



# کورتە باسێک دەربارەی بەرنامەی (streambox Ripper v2.009)

ک: شەقڵاوەیی

بەرنامەیەکی تایبەتە بە گۆڕینی دەنگ لە EXTENTION ی (MP3، CDA.RM.RA.WAVE) بۆ یەکێک لەمانە: WMA)MS AUDIO 4.0. MPEG LAYERS3) WAVE .(MP3) ئەویش بۆ بەکارهێنان لە دروست کردنی کارتی پیرۆزبایی و کارتی ئەلیکترونی و دروست کردنی سیدی دەنگی کە ئیش دەکات لەسەر ئامێری ڤیدیۆ سیدی (CD PLAYER. PLAY STATION).

قەبارەی بەرنامە /١,٦٤ میگا بایتە .

کاتێک کار بەم بەرنامەیە دەکەین ئەمەمان بۆ دەکرێتەوە، (وێنەی ژمارە١)، دوگمەی LOAD دابگرە بۆ هەڵبژاردنی ئەو گۆرانیە یاخود ئەو دەنگەی ئەتەوێ بیگۆڕی ئەم پەنجەرەیەت بۆ دەکرێتەوە (وێنەی ژمارە ٢)، مەلەفی دەنگەکە هەڵبژێرە وە دوایی OPEN بکە.




وێنەی (٢)

دەبینین دەگەڕێینەوە پەنجەرەی یەکەم، بەڵام تەماشا دەکەین هەندێک گۆڕانکاری کراوە لە بەرنامەکە وەکو دیارکەوتنی ناوی گۆرانیەکە وە زانیاری دەربارەی وە کاتی گۆرانیەکە لەسەرەوەو خوارەوەی پەنجەرەکە بەدیار دەکەوێت، وە دەتوانی گوێ لە گۆرانیەکە بگری لە ڕێگای داگرتنی ئەو سەهمەی کە لە تەنیشت کاتی مەلەفەکەیە وەکو لەوێنەکەدا دیارە (وێنەی ژمارە ٣) .

دوای ئەوە دوگمەی CONVERT دابگرە بۆ کاری گۆڕینەکە، وە لەم وێنەی خوارەوە ( وێنەی ژمارە ٤ ) دەتوانین گۆڕانکاری بکەین لەم بەشانە ( خاوێن کردنەوەی دەنگ، بەکارهێنانی هەوا، زیاد کردنی دەنگ، . ... هتد ). وە شی کردنەوەی بەم شێوەیە : -

١- ئەو شوێنەمان نیشان دەدات کەوا مەلەفەکانی تێدا دائەنێت واتە پاش




وێنەی (١)

گۆڕین، وە بۆ گۆڕینی شوێنەکە دوگمەی CHANGE دابگرە .

٢- لێرە جۆری ئەو مەلەفە دیاری دەکەین لە کرداری گۆڕینەکە( MS AUDIO ، WAV ، (MP3) MPEG LAYERS 3 )

٣- دیار کردنی سافی دەنگ، واباشە بەرزترین نرخ بێت ٢٥٦ KBPS .

٤- دەتوانین هەندێ زانیاری بنوسین لەسەر مەلەفەکە وەکو ناوی گۆرانیەکە یاخود مەلەفەکە، یان ناوی گۆرانی بێژەکە یان ناوی ئەو سایتەی کە گۆرانیەکەت تێیدا وەرگرتووە .... هتد.

٥- لێرە دەتوانین تەڕەدوودی دەنگەکە دیاری بکەین، واباشە بەرزترین نرخ بێت ئەویش 44100 HZ .

٦- دیاری کردنی جۆری دەنگ (MONO.STEREO) .

کاتێ کارەکان تەواو بوو OK بکە .

لەم وێنەی خوارەوە (وێنەی ژمارە ٥) مەلەفەکە دەست بە گۆڕین دەکات بۆ ئەو بەشەی دامان ناوە: -

١- بریتییە لە کاتی سەرەتای مەلەفەکە.

٢- کاتی خوێندنەوە و گۆڕینی.

٣- کاتی کۆتایی مەلەفەکە.

٤- خێرایی گۆڕین ئەویش ئەپێورێ بە X .

٥- ناوی مەلەفە گۆڕاوەکەو پاشگرەکەی وە شوێنەکەی.

٦- جۆری مەلەفی گۆڕاوەکە.




وێنەی (٣)




وێنەی (٥)




وێنەی (٤)

# مەبەست لە بلوتوز چیە (Bluetooth)




ئا: ڕێبوار کەریم

پەیوەندی نێوان دوو ئامێری جیاواز بەبێ بونی تەل.

تەکنەلۆژیای پەیوەندی (بلوتوز) بیتەل بریتیە لە مواصەفاتێکی جیهانی بۆ بەستنەوەی هەموو ئامێرە ئەلیکترۆنیە دیجیتەلیەکان وەکو کۆمپیوتەر، مۆبایل وکۆمپیوتەری بچوک و دەستی ئامێرەکانی گوێگرتن و کامێرا دیجیتالیەکان کە دەتوانێت ئالوگوری بەیانات و زانیاریەکان بکات لەگەل گورینەوەی فایلەکان لە نێوان دوو ئامێری ئەلیکترۆنیدا وە دەتوانێت زانیاری لەئەنتەرنێت بگوڕێتەوە بەبێ بونی تەل. ئەم بەشە گرنگەی بواری تەکنەلۆژیا زیاتر پەرەی پێدرا لەلایەن کۆمەلێک لەو کەسانەی کە لەم بوارە کاریان دەکرد گروپەکەش بەناوی (BLUTOOTH SPECIAL INTEREST GROUP GIS).

بیرۆکەی بەیەک بەستنەوەی دوو ئامێری ئەلیکترۆنی لەڕێگای بلوتوزەوە (BLUETOOTH):

بلوتوز تەکنەلۆژیایەکی نوییە وەکو لەسەرەوەش باسم کرد دەتوانرێت پەیوەست بێت بەزۆربەی ئامێرە ئەلیکترونیەکان بەبێ بونی کێبل یان تەل یان وایەر .

ئێستا زیاتر لە ١٠٠٠ کۆمپانیا لە جیهاندا گرنگی بە بلوتورز دەدەن کە بە گروپی SIG ناسراون کە کورتکراوەی (BLUETOOTH SPECIAL INTEREST GROUP) ئەم تەکنەلۆژیا نوییەش بۆ جێگرتنەوەی شوێنی پەیوەندیە بە تەلەکانە .

جیاوازی نێوان بلوتوزو پەیوەندیە تەلیەکان زۆر رون و ئاشکرا دیارن ئەوەی راستی بێت ئێمە زۆربەمان دەزانین پەیوەندیە بێتەلەکان بەکار دێن بۆ زۆر لە بەجێهێنانی کارەکانی رۆژانە یەکێک لەو رێگایانانەی پەیوەندیە بێتەلەکان لەرێگای تیشکی خۆرە کە بریتیە لە تیشکی ژێر سور کە بەچاو نابینرێت و زۆر کرداری پێ جێبەجێ دەکرێت لەوانە گواستنەوەی زانیاری بۆ شوێنی نزیک وەکو کۆنترۆلی تەلەفزیۆن کە بە (INFRARED DATA ASSOCIATION) ناسراوە کورتکراوەکەی بریتیە لە(IRDA) وە بەکاردێت بۆ زۆر ئامێری تر وەکو مۆبایل بەلام دوو کێشە بەربەستن لە بەردەم بڵاوبونەوەی ئەم ئامێرە یەکەمیان مەوداکەی دەبێت نزیک بێت نابێت لە مەودای بینینی چاو دورتربێت وە دەبێت راستەوخۆ ئاراستە بکرێت وەکو کۆنترۆلی تەلەفزیۆن دووەم ئەم تەقەنیە تەنها بۆ یەک ئامێر دەبێت و بەس واتا ناتوانرێت زانیاری بۆ دوو ئامێر بگوازێتەوە لە یەک کاتدا بۆنمونە تەنها دەتوانێت لە نێوان دوو مۆبایل زانیاری بگوازێتەوە .ئینجا بۆ چارەسەرکردنی ئەم دوو کێشەی سەرەوە بلوتوز داهێنرا، لە دوایدا لەلایەن کۆمپانیاکانی SIEMENS.INTEL.TOSHIBA. MOTOROLA. ERICSSON گرنگی پێدراو لە زۆربەی ئامێرە ئەلیکترونیە دروستکراوەکانیان ئەم بەشەو پارچەیان بۆزیاد کرد، ئێستا لە زۆربەی کارە گرنگ و هەستیارو خێراکان ئەم بلوتوزە بەکار دەهێنرێت . لەبەر ئەوەی تەرەدودی ٢،٤٥ گێگا هێرتزە بەمەش دەتوانرێت بۆ زۆربەی ئامێرە پزیشکیەکانیش بەکار بهێنرێ و سودی لیوەر بگیرێت .

# چۆن مۆبایلەکەت مەشغول دەکەیت

حسن عمر

لـە کاتێکدا گەر بتەوێـت تەلەفۆنەکەت مەشـغول بکەیـت و بتوانیـت تەلەفۆنت بکەیـت بـۆ هەرشـوێنێک، یـان شـوێن هەیـە حـەز ناکەیت کـەس تەلەفۆنت بۆ بـکات یان لەبەر هەر هۆیـەک بێت حەز بکەیت کـە مۆبایلەکەت کـەس نەتوانێت پەیوەنـدی پێوەبکـەن و مەشـغول بێت ئەوا بەئاسـانترین شـێوە دەتوانیت ئەم کارە بکەیـت ئەویـش بـەم هەنگاوانەی خوارەوە :

لـە سـەرەتادا ئەم ژمارانـە لێبدە ( *، ٢،١، *، ٠، ٨، # ) دوایـی پەنجـە بنـێ بە ئایکۆنـی پەیوەنـدی واتـە ( OK) . دوای ئەوەی پێویسـتمان بەم کردارە نەما ئەوا بۆ رەت کردنەوەی ئەم هەنگاوانە پەیرەو بکە لەسـەرەتادا ئـەم ژمارانە لێبدە ( #، ٢،١، # ) ئینجـا پەنجـە بنێ بـە ئایکۆنی پەیوەنـدی واتە (OK) بەمـەش مۆبایلەکە دێتەوە سەر باری ئاسایی خۆی .

## ئاگاداری

داوا لە هەموو ئەو خوێنەرە بەڕێزانە دەکەین کە هەر پێشنیارێک یان هەر تێبینێک یان هەر رەخنەییێکیان هەبوو یان هەر کەم و کورێکیان لـە گۆڤارەکـە بـە دی کرد با ئاگادارمان بکاتەوە بەم ناونیشـانە : هەرێمی کوردسـتانی عێـراق / یەکەی کۆمپیوتەر لـە دیوانی وەزارەتی رۆشنبیری لە هەولێر جادەی شەست مەتری نزیک هۆلی زەرد ژمارە تەلەفۆنی ٢٢٣٢٧٢١ مۆبایل ٠٧٥٠٤٦١٨٠٤٥ یان پۆستی ئەلکترۆنی.

Email : computer_magazine_2005@yahoo.com

Email : aras_co_center@yahoo.com

Email : aras_aaa@hotmail.com

# چین بەرەو تەکنیکی دەروات لەخۆ ئامادەکردن بۆ ئۆلۆمپیاتی ٢٠٠٨

ئا: پەرژین



پەکین (چین)

یەکێک لەشوفێری تەکسی لەشاری نیویۆرک کەلەئوتومبێلەکەی خۆیدا تەلەفزیۆنێکی زیاد کردووە لەدواوە وە بەم جۆرە خەڵکانێکی زۆر داواکارن لەسەر زیاد بوونی ئەم تەکنەلۆجیایە بۆ بینینی مۆندیالی ٢٠٠٨ لەکاتی سەفەریان یاخود هەرکاتێک لەناو ئوتومبێل بن بێ بەش نەبن لەبینینی مۆندیال بەم شێوەیە چین بریاری داوە لەداهاتوەکی نزیک بری (١٠٠٠٠) ئوتومبیلی تەکسی لەم جۆرە ئامادەبکات . بۆزیادکردنی هۆکارەکانی بینین.

# ماوسی کۆمپیوتەر دەبێتە هۆی توش بوون بە التهاباتی عصبی

ئا: دلاوەر



زۆربەی بزیشکان دووپات لەسەر ئەوەدەکەنەوە کە ماوسی کۆمپیوتەر دەبێتە هۆی توش بوون بە التهاباتی اعصاب لەدەست و مەچەک کەبەوەدەچی بەالتهاباتی کریکارانی ناو (مناجم) ئەوانەی (حفارات) بەکاردەهێنن یان هەڵگرتنی شتی قورس بەبەردەوامی.

سەرۆکی بەشی اعصاب لەنەخۆشخانەی (دیواری سیرافین) کەوا ٥٠ کەسی نەخۆش هەفتانە دەچن بۆچارەسەری دەستیان کە توشی ئەو هەوکردنە (التهاب)ە بوونە . وەئەم نەخۆشیەش چەند ئێش و ئازارێکی زۆر زیاد دەکات کەدەبێتە هۆی لەخەوهەستان بەشەوان بەبێ هۆ ! وە دەرکەوت کە پێنج لەوانەی سەردانی ئەو نەخۆشخانەدەکەن کۆمپیوتەر زۆر بەکاردێنن بۆماوەیەکی زۆر بەبەردەوامی وە پرۆفیسۆری بەناوبانگ دکتۆر (التشیکی فلادیمیر ماریک) چەند تاقیکردنەوەیەکی جۆراوجۆری ئەنجامدا لەسەر ئەوانەی کەزۆر دەرزی لەخۆیان دەدەن هەروەها لەسەرئەوانەی کەزۆر بورغی دەسورێنن وەلەسەرکرێکارانیش و لەسەرئەوانەش کە زۆر یاری تێنس دەکەن پاش دەرچوونی ئەنجام دەرکەوت کەئەوانەی زۆر ماوسی کۆمپیوتەر بەکاردەهێنن ئەم نەخۆشیە زیاتر کاریان تێدەکات و ماوسیش دەبێتە هۆی سەرەکی ئەم نەخۆشیە.

# چەند کردارێکی وەرزشی بۆ ئەو کەسانەی کەزۆر کۆمپیوتەر بەکاردێنن

وەرزشی کۆمپیوتەر: بۆ ئەو کەسانەی بۆ ماوەیەکی زۆر لەسەر کۆمپیوتەر کاردەکەن. بۆ ئەوەی تەندروستیان باش بێت و تووشی هیچ گیروگرفتێکی جەستەی و دەروونی نەبن



10 - 20 چرکە
دوو جار



10 - 15 چرکە



8 - 10 چرکە



15 - 20 چرکە



3 - 5 چرکە
3 جار



10 - 12 چرکە
بۆ هەردوو ناو لەپ



10 چرکە



10 چرکە



8 - 10 چرکە
هەردوو لا



8 - 10 چرکە
هەردوو لا



10 15 چرکە
دوو جار



جوولاندنی سەر دەستەکان
8 - 10 چرکە

لە ئامادەکردنی بۆب و جیان ئاندەرسن 2000 دەزگای شێلتەر وەرگێڕانی: نبیل عبدالرحمن فتاح

# لابردنی کۆنترۆڵ پەناڵ

## ئا: هەڤاڵ کوردی

زۆربەی زانیاریە لەدەست چووەکان و تێکچونی سیستەمەکانی کۆمپیوتەرو سڕینەوەی فایلەکانی سیستەم و بەرنامەکان لە ڕێگای کۆنترۆ پەنەل دەبێت و بەدەستی ئەو کەسانە دەبێت کە شارەزایەکی ئەوتۆیان نیە لە کۆمپیوتەر، جا بۆئەوەی لەم کێشە چاوەڕوان کراوەدا دەرباز بین پێویستە ئاسانترین ڕێگە بگرینە بەر ئەویش بریتیە لە شاردنەوەی کۆنترۆل پەنال لە تەواوی سیستەمەکەدا.

بۆ بەجێگەیاندنی ئەم کارەش لە سەرەتا دا دەچینە سەر (START) دوایی کلیک دەکەین لەسەر (RUN) ئینجا (GPEDIT. MSC) دەنوسین دوایی کلیک لەسەر (OK) دەکەین بڕوانە وێنەی ژمارە (١) دواتر چاوەڕێ دەکەین تا ئەم چوارگۆشەیە دەردەکەوێت کە لەوێنەی ژمارە (٢) کەبریتیە لە (GROUP POLICY) دا دیارە ئینجا کلیک لەسەر (ADMINISTRATIVE TEMPLATES) دوایی ڕاستەوخۆ دوو کلیک لەسەر کۆنترۆل پەنال دەکەین چوارگۆشەیەکی تر دەکرێتەوە بڕوانە وێنەی ژمارە (٣) ئینجا ئەمجارەشیان دوو کلیک لەسەر (PROHIBIT ACCESS TO THE CONTROL PANEL) دەکەین لە چوارگۆشەی کە دەردەکەوێت لە وێنەی ژمارە (٤) کلیک لەسەر (ENABLED) دەکەین دواتر OK دەکەین بەمەش کونترۆل پەنال لەسیستەمەکە ون دەبێت بۆ گەڕانەوەش هەمان کردار جێبەجێ دەکەین بەلام ئەمجارەیان (NOT CONFIGURED) هەلدەبژێرین کلیک لە OK دەکەین.


وێنەی (١)


وێنەی (٢)



وێنەی (٣)

# بۆ بەکارهێنەرانی کۆمپیوتەری لاپتۆپ

ئا: کوڕی کۆیە




لابتۆب جۆری FUJITSU SIEMENS
مۆدیل L1300
P4 INTEL CELERON
CPU PROCESSR 1.4.1 MB MEMORECASH
RAM 512
HARD 40 GB
DVD R DVD RW SUPPORT
MONITAR 15.4 TFT WXGA1280X800
VGA64DVMT
USB 2.0PORT 3
LAN CARD
MODEM56




لابتۆب جۆری FUJITSU SIEMENS
مۆدیل L1300
P4 INTEL PENTIUM
CPU PROCESSR 2.80.1MB MEMORECASH
RAM 256
HARD 40 GB
DVD R DVD RW SUPPORT
MONITAR 15.1 TFT WXGA1024X768
VGA64DVMT
USB 2.0PORT 3
LAN CARD LINK
MODEM56KB LINK

AL ITKAN VISION

We make sure

FUJITSU SIEMENS

AMILO Pro V2010 Edition

Your gateway to professional mobile working

لابتۆب جۆری FUJITSU SIEMENS

مۆدیل L1300

P4 INTEL CELERON

CPU PROCESSR

1.5.512MB MEMORECASH

RAM 256

HARD 40 GB

DVD R CDRW COMDO

MONITAR 15.1 TFT WXGA1024X768

VGA64DVMT

USB 2.0PORT 3

LAN CARD LINK

MODEM56KB LINK

AL ITKAN VISION

We make sure

FUJITSU SIEMENS

AMILO Pro V2020

Your gateway to professional mobile working

لابتۆب جۆری FUJITSU SIEMENS مۆدیل L1300

P4 INTEL PENTIUM

CPU PROCESSR

1.7.512MB MEMORECASH

RAM 512

HARD 60 GB

DVD R CDRW INTERNAL

MONITAR 15.1 TFT WXGA1024X768

VGA64DVMT

USB 2.0PORT 3

LAN CARD LINK

MODEM56KB LINK